

دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
FAMpublication
بەڕێوەبەری گشتی: سەنگەر زراری



چاپی یەکەم - ٢٠٢١

# ڕۆژگاری وشک و چاوی تەڕ

نووسینی

## تەڵعەت تاهیر

بابەت: دونیابینیی ئەدەبی

پێوانە: ١٥*٢٣سم (٤٠٠) لاپەڕە

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (١٠٢١)ی ساڵی ٢٠٢٠ی پێ دراوە.

**ناوەڕۆك**



لە سەرەتاوە

**مــونــەمــنــەمــات**

کاتێ تازە دەستم بە نووسینی شیعر دەکرد، وێنەی شاعیرەکان لە کتێبی "مێژووی ئەدەبیاتی کوردی"ی مامۆستا عەلائەدینی سەجادی جێی سەرنجی بەردەوامم بوو، زیادەڕۆیی نیە گەر بڵێم حەزم دەکرد ڕۆژێ لە ڕۆژان منیش ببمە یەکێک لەو سوڵتان و میرانەی کە لەژێر وێنەکانیاندا ئیمزایەکی سەیر هەبوو (تا دواتر زانیم ئیمزای هونەرمەندی گەورە "بەدیع باباجان"ە). وێنەی شاعیرە کلاسیکییەکانی کوردم لە دووتوێی کتێبەکەدا دەبینی، بە سەرسوڕمانەوە سەیری جلوبەرگ و ڕیش و سەروسیمام دەکردن، نالی، مەحوی، مەولەوی، بابەتاهیری هەمەدانی، مەلای جەباری و سالمی سنە و حەریق و ئەدەب و بێسارانی و مەجدی و ئەحمەدی خانی و.. هتد، مێزەری جیاواز لەوەی باوکم و سەدریەی جیاواز لەوانەی حاجییەکانی مزگەوتە نزیکەکەی ماڵمان. ڕدێنی لوول.. بەڵام بێ گرێ و قەڵەمکراو، هەنییەی ساف و نوورانی، یەخەی بەنەقش و پاك، قۆپچەی زیوینی جوان و مەحکەم، برۆی باریك و سمێڵی ئەستوور، لووتی بچووك و بەرز، مووڕەش و چاوگەورە، برژانگ کورتی چەناگەدرێژ.. ئەوسا حەزم دەکرد منیش ئاوا نەقش بکرێم، ئەو وێنانە وای دەکرد چەندین جار لەبەرخۆمەوە دیالۆگ لەگەڵ ئەو شاعیرانە ئەنجام بدەم، پێم وابوو شاعیربوون ئەو هەیبەت و ویقار و پۆشتەییە مسۆگەر دەکات، خۆ لەوانەیشە جوانی ئەو وێنانە لای من لەوەوە هاتبێت، کە نەمدەویست دانی پێدابنێم چەند خۆم بە ناشرین دەزانی. هەمیشە پرسیارم دەکرد ئەمانە لە

کێ دەچن؟! تەنانەت پێشم سەیر بوو ئەو سوڵتان و میرانە ئەو کوردییە جوانە بزانن، دەمگوت ئاخۆ لە کێ و لە کوێ فێری بوون؟ تا گەورەتر بووم و زانیم ئەو وێنانە لە سوڵتانەکانی عوسمانی و میرەکانی فارس و والییەکانی ئیسلامی دەچن، بە تایبەتی هونەری وێنەی دەستنووسە کۆنەکان، کە پێی دەڵێن "مونەمنەمات" و فارسەکان لە سەدەی حەفتەمی زاینییەوە دەستێکی باڵایان تیادا هەبووە، هەرچەندە بیزەنتی و هیندی و عوسمانییەکان، تەنانەت پێشتر چینییەکانیش ئەو دەستنووسانەیان پێ ڕازاندۆتەوە کە لەسەر پێستی ئاژەڵ تۆمار دەکران.

"**مونەمنەمە**" مانای فراوان لە خۆ دەگرێت، بەو وێنە و زەخرەفە بچووکانە دەگوترێت کە دیکۆمێنت و دەستنووسەکانی پێ دەڕازایەوە، بەرگی ڕەنگداری بۆ ئەو داستان و ئەفسانانە پێ دەکرا کە لە مەجلیسی سوڵتانەکاندا دەخرانە بەر قسەوباس، هەروەها پۆرتریتی سوڵتان و میرەکانیشی پێ کراوە، هەرچەندە ئیسلام دژی ئەو جۆرە هونەرە بووە و بە حەرامی لە قەڵەم داوە و هەمیشە هونەرمەندەکانی ئەو هونەرە لە پەراوێزدا ژیاون و نەیانتوانیوە لە سەردەمی خۆیاندا ئیمزا لەسەر وێنەکانیان بکەن، بەڵام لە سەردەمی عەباسییەکاندا **مونەمنەمە** پەرە دەسەنێت و خەلیفەکانی عەباسی کۆمەڵێکی زۆر لەو وێنانە دەگوازنەوە بەغدا. تەنانەت ئێستاش لە ئێران و تورکیا ئەو هونەرە قوتابخانەی تایبەتی هەیە و وەك میراتێکی فەرهەنگی و کلتووری گرنگیی زۆری پێ دەدرێت. من لەوە دەگەم کە

هونەرمەندێکی گەورەی وەکو "بەدیع باباجان" لە ڕێگەی ئەم جۆرە تەماهیکردن و وێکچواندنەوە ویستوویەتی وەکو میر و شا و سوڵتان نەقشیان بکا و پایەی شاعیرانی کورد بەرز بکاتەوە، تەنانەت ئەو وەسفانەی مامۆستا عەلائەدین سەجادی لە نامەیەکدا بۆ باباجان شێوەی و ئەدگاری شاعیرەکانی بۆ وێنا دەکا، وەکو خۆی دەریدەهێنێ و نەقشیان دەکا، لەوەشدا هونەرمەند بەدیع باباجان باشی بۆچووە، چونکە لە سەردەمی عوسمانی و قاجاریدا، تەنانەت لە خۆرئاوای سەدەکانی ناوەڕاستیشدا ئەدەب و هونەر وابەستەی مەجلیسی سوڵتان و شا و میرەکان بوون، ئەدەب و هونەر بۆ سەواد و عامی خەڵك نەبوو: هەر چێژیشیان لێ وەرنەدەگرت، ئەوەندەی چێژیان لە بەیت و بالوورە و هونەری میللییەوە وەردەگرت، خۆ بتهۆڤن پیانۆی بۆ خەڵك نەدەژەنی گەر لە چینی ئوروستوکرات نەبوایە، ئەو هۆڵانەیش کە دەکرا مۆسیقای تێدا بژەنرێت هەر لای میر و شاکان دەست دەکەوت. لێرەوە باباجان مافی خۆیەتی هەمان پلەوپایە بداتە شاعیرانی کوردیش. لەوەش دەگەم کە ئەوە ئەوپەڕی خۆشەویستی بووە بۆ بەرهەم و کەسایەتیی ئەو شاعیرانە. بەڵام کە گەورەتر بووم و تا ڕادەیەك تاقەتم بەسەر خوێندنەوەی شیعری کلاسیکدا پەیدا کرد: ئەو وێنانە وردوخاش بوون، زانیم شاعیرانی کورد زۆربەیان (ئەوە گەر نەڵێم هەموویان) نەك وێنە و مونەمنەماتیان نەبووە، بەڵکو زۆربەیان گۆڕغەریب بوون، "حاجی قادر" نەك میر و شاهانە نەژیاوە، ناشزانین کە لە کۆیە

دەرکرا بە کویێشدا گوزەری کرد؟! ئەو "کۆیە"یەی حاجی خۆی لەبارەیەوە دەڵێ **(هەر وەکو شارانیتر کەس ئاشنای کۆیە نەبوو.. شوهرەتی ئەبیاتی من خەڵکی لەسەر کۆکردەوە).**

"نالی" ئەو کاتەی لە شاری مەککەدا سێ بزنی بەخێو دەکرد (وەك مەسعوود محەمەد لە زاری باوکی دەیگێڕێتەوە)، زۆر لەوە نەدارتر بووە دانیشێت و پۆرتریتی بۆ بکێشرێت، ڕاستە شیعرەکانی هەزاران میر و شا دێنێ، بەس ئەدگار و سەروسیمای: **زارە وەکو هیلال، نەحیفە وەکو خەیاڵ..** پۆرتریتی شاهانەی ناوێ: هێندەی بەسە **بکەوێتە زار و بە دڵدا بکا خوتوور.** بەرامبەر ئەو خەیاڵە خۆشانەی بە شاعیربوونەوە دەمبینی، ساتی بە ئاگا هاتنەوەم هێشتا نەهاتووە، ئێستایش بە خەیاڵ حەز دەکەم شاعیرە کلاسیکییەکانمان هەر بەو بەرگە پاك و پۆشتانەوە وێنا بکەم کە لەگەڵ ئاستی بەرزی شیعریان یەك دەگرێتەوە، هەرچەندە بینینی وێنەی ڕاستەقینەی ناری و قانع و بێکەس و ئەسیری و عەبدوڵلا گۆران بەو هەموو لاوازیی جەستە و چاکەتی تۆزاوی و لۆچی ڕوخسار و ئەندێشە و موعاناتەوە، جار جارە نقورچ لە خۆشباوەڕیم دەدەن.



**مارف خەزنەدار**

**دوایین پیری "نالی"ناس**

## نەیماوە غەیری زیکرێکی یا سەبوور
## نالی

لە کۆتـایی سـاڵانی هەشـتاکانی سـەدەی ڕابـردوو (قورسیشـە منداڵی و هەراشیم بخرێتە سیاقی سەدەی ڕابردووەوە)، بۆ یەکەم جـار چـوومە مـاڵی دکتـۆر مـارف خەزنەدار، بە بێجـامەیەکەوە سەرقاڵی باخچەی ماڵەکەی بوو، بۆ منـی تـازە هەراش، دانیشـتن لەگەڵ پیـاوێکی لە چەشـنی دکتـۆر مارفـدا کە مەلەوانێکـی شـارەزای بەحـری نـالی و ناسـراوترین ڕوونـاکبیری هەولێـر و بەرگریکـارێکی لەسـەر هەقـی "ڕەمـزی نـافیع" و کـوردایەتی، کـارێکی تـا بڵێـی مـایەی کـامەرانی بـوو، دوای ئەوەی بە دەم قسەوە هەنـدێ بێڵکاریمـان لە بـاخچەکەی کـرد، چـوومە ژوورە پڕاوپـڕ لە کتێـبەکەی، هەر زوو سـیحری ئەو ژوورە دایگـرتم، منێك لەگەڵ دوو بـرا و دوو خوشـك لە ژوورێکـدا دەخەوتـین، زۆر جار لە حەوشەدا کتێبم دەخوێندەوە و زوو زووش بـاوکم لە کتێـبەکەی دادەبڕانـدنم لەوەی کاسـبیەك بـکەم باشـترە، لەپـڕ کەوتمە نـاو بەهەشـتەکەی ئەلیجێـری دانتـی، کەوتـمە نـاو بـۆنی کتێبان (کە دواتر زانیم بـۆنی کتێبخـانە زۆر لە بـۆنی نـاو کڵێسـا دەچێت).

مـن گەنـج بـووم و ئەویـش لەوسـەری هەمـوو بابەتەکـان هاتبۆوە، من باسی شۆفەلێکم دەکرد کە پێویستە هەرچی ئەدیبی کوردە ڕایماڵێ، ئەویش خەمی ئەوەی بوو کە نالی چەند بەیتـی مولەمەعی هەیە. من پێم وابوو کورد پاکترین میللەتی مێژووە و

ئەو پێی وابوو نەتەوە شەقاوێك ئەولاتری عەشیرەتە، من خوێن گەرم بووم و دەمویست لەناو شاعیرانی گەڕەکی کوراندا یەکەمین بم و ئەو هێشتا سیحری جوانییەکانی سان بترسبۆرگ بەری نەدابوو. پێویستە بڵێم کە من زۆر قەرزاری "دکتۆر مارف"م، هەمیشە دەرگای ماڵەکەی بۆ من کراوە بووە، قەت ڕەزیلی نەکردووە لە وەڵامێك کە پرسیارەکەی خەوی لێ سەندووم، یەکەم کەس بووە دەستی گرتووم لە تێگەیشتنی کلاسیکی کوردی، لێکدانەوەی بەنرخ و ناوازەی هەبوو بۆ شیعری نوێی کوردیی سەردەمی عەبدوڵڵا گۆران و نەوەکەی. زۆر جار بەیەکەوە دەچووینە گەڕەکەکانی تەعجیل و عەرەبان و بیریژیان و یەکە یەکە نەخشەی کۆنی هەولێری پێ دەناساندم، باسی شەتڵە خاسی لە شوێنانێك دەکرد کە بیووە کتێبخانە و پەنجەی بۆ کۆلانێك ڕادەکێشا کە کاتی خۆی کاریز بووە، ناوی ئەو ماڵە دەگمەنانەی پێ دەناساندم کە لە ساڵانی چلەکاندا بە کوردی لە ماڵەوە قسەیان دەکرد، باسی قوتابخانەی ئەدەبی سۆفیگەری و شیعری ئۆتۆماتیکی سۆفییەکانی مێژووی ئیسلامی بۆ دەکردم، کە پێش چەندین سەدە لە خۆرئاواییەکان نوێگەرییان داهێناوە (ئەو نوێگەرییەی کە لە سەدەی بیستدا خۆرئاواییەکان پێوەی دەنازن!) لە ڕێی ئەوەوە من کتێبی (عروج)ی محێدین بن عەرەبی و (الامتاع والموانسة)ی ئەبی حەییانی تەوحیدی و (فن الهوا)ی ئۆڤید و (کۆمیدیای ئیلاهی)ی ئەلیجێری دانتیم خوێندەوە، لە ماڵەکەیدا عەبدولخالق مەعرووف و بەدیع باباجانم ناسی، هەردەم سفرەی خواردن و

سفرەی زانست و سفرەی کتێب بۆ هەمووان واڵا بوو. خانەوادەیەکی هەبوو لە ئاو پاکتر و لە حەلوا نەرمتر. زۆر باسی نووسینەوەی یاداشتمان دەکرد، بیرمە هەندێ کتێبی یاداشتیشم بۆ برد کە پێم وابوو سوودیان دەبێ، لەوانە (ڕاپۆرت بۆ گریکۆ)ی نیکۆس کازانتزاکیس. دواتر بەهۆی کارێکەوە لێکدابڕاین، هەمیشەش دانم پێدا ناوە کە ئەو دابڕانە ئەنجامی هەڵەیەکی کوشندەی من بوو، من خەتابارم لەوەی دوو کتێبی دکتۆر مارفم فەوتاند، گەنج بووم و هەر هێندە لە دنیا دەگەیشتم، دەربەست نەبووم بە دنیا و ڕەفیقایەتییەوە، دوو کتێبەکەم فرۆشت و کتێبی (فی ساعة النحس) گابریێل گارسیا مارکیزم پێ کڕی (کە ئێستاش لای من خۆشەویستترین ڕۆمانە)، هەرچەندە ئەمە شەفاعەتم بۆ ناکات لە فەوتاندنی دوو بەشەکەی (تاریخ المانیا الهتلریة) و چەندین جاریش داوای لێبوردنم بۆ ناردووە و هەموو جارێکیش بە دڵە گەورەکەی پەیامی بۆ دەناردم و گوتبووی: "کتێب بە قوربانی تەڵعەت بێ، بەڵام با بیبینم و بێتە لام و سەردانم بکات". من بوومە منداره سلێمانی و بەدیار ئەزمەرەوە ڕۆژانم دەگوزەراند و ئەویش هەر لە ماڵە ڕووناکەکەی لە گەڕەکی ڕووناکیدا مایەوە، بۆ زیاتر لە پانزە ساڵ من لە قسە و زانست و کەسایەتیی ناوازەی دکتۆر مارف دوور بووم و ڕووم نەبوو چاوم بە چاوی بکەوێتەوە، بەڵام خەفەتم لەوەدایە کە مرد و پێم نەگوت چەندم خۆش ویستووە، مرد و وەکو پێویست داوای لێبوردنم لێ نەکرد، هیتلەر تەنیا جوولەکەکانی نەسووتاند، پەیوەندییە جوانەکەی من و دکتۆر

مارفیشی سووتاند، مێژووی ئەڵمانیای هیتلەری، مێژووی نێوان من و دکتۆر مارفیشی کاول کرد، چەند حەز دەکەم ڕۆژگار بسووڕێتەوە و دەست بۆ ئەو دوو کتێبە نەبەم، ڕۆژان بێتەوە و خاکەناسێك بگرم و لە باخچەکەیدا باسی جۆرەکانی شەڕاب و شیعری نالی و پەنجا فلسەکەی محەمەد مەولوود مەم بکەینەوە (ئەمجارەیان شەرت بێ قسە لە قسەی نەکەم و تەنیا سەر ڕاوەشێنم).



نـــالـــی..

پیاوی گەورەتر لە ناونیشانەکان

(١)

دەمێکە لەگەڵ خوێندنەوی نالیدا سەروبەندم هەیە، بەڵام لە ئاست گەورەیی ئەو زاتەدا، وەك مەحبووبەکەی، بەندم هەبووە و قەندم نەبووە! من هەمیشە ئەو پیاوەم بە باپیرە گەورەی خۆم زانیوە، زۆربەی ئەو هاوکێشە شیعریانەی گەیاندۆتە ئەنجام کە نەوە دوای نەوە سەرقاڵی مشتومالکردنین. نالی شێوەی ماڵێکە کە بێژمار پەنجەرەی هەبێت، لە هەر پەنجەرەیەك بۆی دەڕوانیت ئەوا سەدانی دیکەت فەرامۆش کردووە، ئەمە وێڕای دەرگاکەی! دەکرێت لە چەندین تەوەری زیندووی ئەدەبی بدوێین کە نالی تیایدا پێشەنگ بووە، ئەمەش وای کرد کە چەندەی هێنام و بردم ناونیشانێکم بۆ ئەو جوانمێردە بۆ نەدۆزرایەوە، تا ناچار بووم بیخەمە سەرووی هەرچی ناونیشانە. ئاخر ناونیشانەکان لە چاو ئەو بەحرەدا جۆگەلەن. بە بەراورد لەگەڵ ئەو خۆرەدا، غوبارن. کابرا خاوەنی یەکەم شیعری هەجووە؟ ڕووهەڵماڵین و هەجووی کێش؟ ماە شەرەف خانم (مەستوورە)ی لەلەی شازادەکانی ئەردەلان و هاوسەری خوسرەو خانی سنەیی!:

*مەستوورە کە حەسنا و ئەدیبە بە حیسابێ*
*هاتە خەوم ئەمشەو بە چ نازێك و عیتابێ*

ئەو پیاوە خاوەنی یەکەم شیعری ئاژەڵدۆستییە، چ ئاژەڵێکیش (گوێدرێژ) کە زیاتر لە جارێك لە قورئانیشدا ناوی بە دەنگ ناخۆش و کەم عەقڵ هاتووە و سووکایەتی پێ کراوە!:

مەی کەریکم بوو، چ پەیکەر؟ گەی کەری هەوراز و لێژ
سینە پان و مووچە کورت و شانە بەرز و گوێ درێژ

***

مل عەلەم، شیرین قەلەم، ئاهوو شکەم، مەیموون قەدەم
سم خڕ و کلك تیستر و مەنزڵبڕ و عارەق نەڕێژ

***

چەندە پێم خۆش بوو زوبانی حاڵی دەیوت نالیا
هەردوو حەیوانین، ئەتۆ گوێ کورت و ئەمنیش گوێ درێژ

ئەمە وێڕای ئەوەی کە نالی خاوەنی یەکەم دەقی مەهجەر و ئیغترابیشە:

قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور
وەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور

***

دەموت دوو چاوی خۆمە ئەگەر بەکرەجۆیی ئەشك
نەبوایە تیژ و بێ سەمەر وگەرم وسوێر و سوور

***

واصل بکە عەبیری سەلامم بە حوجرەکەم
چی ماوە، چی نەماوە، لە هەیوان و تاق و ژوور؟

***

زارم وەکو هیلال و نەحیفم وەکو خەیال
ئایا دەکەومە زار و بە دڵدا دەکەم خگوور؟

نالی لە شێوەی مرۆڤە مەزنەکانی دنیا خۆبەزلزانینی نەبووە، دەنا هەرگیز ئەو دێڕەی دوایی نەدەنووسی، ئاخر دڵ ئاوەدان چۆن دەنووسێت کەس باسم دەکات و بیرم دەکات؟! لە کاتێکدا سەدە و نیوێکە هەرچی خوێندەوار و تامکەری شیعرە بە تۆوە سەرقاڵن! چەشنی ئەفسانە فیرعەونییەکان ئەوەی بە پەیژەی چێژەوە سەرکەوێت و ماسکەکانت لابەرێت، گەڕانەوەی بۆ نییە!.

ئەوەتا حاجی قادری کۆیی لە ئەستەنبوڵەوە بۆ ساتێك لەبەر خاتری تۆ کوردایەتی و صەحافە و سەقافەی وەلا ناوە و دەڵێت:

***بەتەزمین بەیتەکی نالی دەهێنم تا ڕەفیقانم***
***بزانن من بە ئەو ناگەم خەزەف قەت وەك گەوهەر نابێ***
***کەمەندی زولفی دوو لانە لەبۆ گەبر و موسوڵمانە***
***دەکێشێ بێ محابانە چ لەم لابێ چ لەو لابێ***

ئەمە نییە هێمن موکریانی پێی وایە لە کاتی لەدایکبوونی هەر منداڵێکی کورد، پێویستە دیوانێکی نالی لە ژوورسەردا بێت! چما چ پیاوی مەزن ماوە لە ناو کورددا لە سەبکی شیعری تۆدا گیرۆدە نەبووبێت؟ (مەلا کەریمی مودەڕیس و فاتیحی کوڕی، مەلای گەورەی کۆیە و مەسعوودی کوڕی، مەلا مەعرووف و عەبدولخالقی کوڕی) ئەو پیاوە مەزنانە گۆڕیان پڕ لە نوور بێت، ساڵەها بە دیار جوانیی تۆوە شەونخونییان کردووە! بۆچی تۆ بەنرخترین گەوهەری ناو خەزنەکەی دکتۆر مارف نیت؟

مەسعوود محەمەد یەك دێڕی تۆی، بیست و شەش ساڵ مشتوماڵ کـردووە و لە ئاگـایی و نائاگیـدا هێنـاویەتی و بردوویەتـی، ئینجاش دەنووسێت (مومکینە شـەرحەکە وانەبێـت!). دوای زیـاتر لە سەدەیەك ئێستاش کەس بە مردنی تۆ بـاوەڕ ناکـات، ئێسـتاش میللەتـی کـورد کاسـێتەکەی کیمیابـارانی هەڵەبـجەی بـۆ هەڵگرتوویت! مەلا عەبدوڵلای باپیری مەسعوود مـحەمەد دەڵـێ: لە مەککە نالیم دیوە و لەوێ موقیم بووە، زۆر پیـر بـووە و سـێ چوار بزنی هەبووە و دۆشیونی، بەو جۆرە ژیـانی گوزەرانـدووە. نالی لە بەخێوکردنی بزن جیـا لە ئاژەڵەکـانی دیـکە لەسـەر هەق بووە، چونکە شـیعرەکانی زۆر ئەتـواری بزنەکێوییـان هەیە، کـام هەڵەمۆتکەی سەختی لێکدانەوەیە لەوێ پیاسە دەکەن، هەمیشە لە دژوارترین لووتکە شاخی مەعناوە غارە غاریانە.

( ٢ )

***نالی خەبەری بێ ئەسەری غائیبە ئەمما***
***ناڵێکی حەزین دێ لە موناجاتی سەحەردا***

نـالی باشـتر لە هەمـووان خـۆی ناسـیوە، پێوسـتە لە نـووزەی خەمگینـی بەرەبەیـان بە شـوێنیدا بگەڕێـین، خەبەری ئەومـان لە پشکووتنی خونچەکان دەست دەکەوێت!

لە نوێژی بەیانیدا دوعا بۆ ئەوە بکەین سەرەدەری لە ونبوونی دەربکەیـن! نـالی لە ئێـوارە و ئاوابوونـدا نیـیە، لە سـپێدە و نوێبوونەوەدایە. نالی هەتـا دنیـا دنیـایە لە هەمـوو خۆرهەڵاتنێکـدا

نیشتەجێیە و داکۆکی لە جوانییە نەناسراوەکان دەکات.

کەمزانینمان دەربارەی ژیانی نالی و غیابی بێ ئەسەری، کەسەردار و پڕ مەراقە، لە هەمان کاتدا شیرینتریان کردووە. نالی نەك شیعرەکانی، خۆی گوتەنی کە سەدەها داویان بۆ خوێنەر ناوەتەوە، بەڵکو ژیانیشی بۆتە مەتەڵ! نووسەرانی کورد هێندەی سەرقاڵی یەکلاکردنەوەی ژیان و سەفەرەکانی نالی بوون، ئەوەندە خەریکی لێکدانەوەی هۆکارەکانی ڕووخانی ئەمارەتی بابان نەبوون! نالی نەك لە شیعر، بەڵکو لە سەرگوزشتەی ژیانیشیدا خۆبەدەستەوە نادا! چ قەدەرێکە نالی، ژیانی ئەوەندە لە شیعرەکانی بچێت؟ هەردوو تەوەریش بە قازانجی نالی و نەگبەتی خوێنەر تەواو دەبن. بێئەسەربوونی ژیانی بۆتە چیرۆکێك کە سەدان سیناریۆی هەیە و هەر ڕۆژەی ئەو چیرۆکەش گرێی درامیی نوێی بۆ زیاد دەکرێت. خۆبەدەستەوەنەدانی شیعرەکانیشی خاسیەتێکی زیئبەقیی پێ بەخشیوە و بۆتە خوانێك بۆ هەموو ئاراستە ئەدەبییەکان، لەم خاسیەتەشدا نالی زۆر لە شکسپیر دەچێت. شکسپیر خوانی هەموو ئاراستەکانە و هی هیچیشیان نییە! نالی وەکو شکسپیر وایە: ڕیالیزمەکان دەڵێن هی ئێمەیە، سووریالییەکان دەڵێن هی ئێمەیە، نەتەوەییەکان دەڵێن هی ئێمەیە، نێونەتەوییەکان دەڵێن هی ئێمەیە! لە ڕاستیدا هی هەموویانە و هی کەسیشیان نییە! ئەوەیە مەزنیی نالی و شکسپیر. نالی ئەسپێکە بە هیچ قوتابخانەیەکی ئەدەبی دەستەمۆ ناکرێ، هیچ بۆتەقەیەکی ئەدەبی نایگرێتەخۆی! هەموو لەخۆگرتنێك ڕەت دەکاتەوە.

## (٣)

## *زاهیر و باتین لەسەر لەوحی حەقیقەت یا مەجاز*
## *ئاشنای سیرڕی قەڵەم بێ غەیری نالی کەس نەما*

یەکێك لە نهێنییە گرنگەکانی قەڵەمەکەی نالی ئەوەیە کە توانیویەتی شیعر بباتە دەرەوەی زەمەن. لە سەرووی چاکە و خراپە، لە سەرووی نەوەکان، لە سەرووی تیۆرەکانەوە، بە شەکاوەیی پارێزراو بێت. نالی خوێنەر ناکات بە لایەنگیر، ئەو کاتەی شاعیر پەیوەست دەبێ، بێ ئایدیایەك خوێنەر دەکات بە لایەنگیر (بێگومان لە هەمان کاتدا کۆمەڵێك کەسیش دەکات بە نەیار)، بەڵکو نالی یەکسان دەبێ بە خوێنەر و خوێنەریش یەکسان دەبێ بە دنیا. نالی شیعر بە قوربانی مێژوو ناکات (وەك حاجی قادری کۆیی کردی)، نالی شیعر بە قوربانی هەژاران ناکات (وەك قانع کردی) نالی شیعر بە قوربانی نەتەوە ناکات (وەك ئەحمەدی خانی کردی)، بەڵکو نالی زیرەکانەتر لە هەموو ناوەکان شیعر دەکاتە زەمبیلەیەك کە تیایدا مێژوو و هەژاریی و بیری نەتەوەیی تێدایە. نالی شیعر بە بوونی شیعریەتەوە دەبەستێتەوە، ئەو دەزانێ شیعر ئامراز نییە بۆ دەرپەڕاندنی هەژاری و مێژوو و بیری نەتەوەیی، بەڵکو ئامانجە بۆ بەرهەمهێنانی شیعرییەت، ئەوەی لە شیعردا دەمێنێتەوە بابەت نییە، بەڵکو چۆنییەتی دارشتنی بابەتەکەیە، لە ڕووی شیعرییەتەوە هەژاردۆستی و کێشە ڕەواکانی، شەفاعەت بۆ قانع ناکەن لە شیعرێکی خراپدا. گرنگی هاندانی لاوانی کورد و داواکردنی

مافه ڕەواکانی کورد، شەفاعەت بۆ حاجی قادر ناکەن له شیعرێکی خراپدا. هەموو ئەوانەی شیعر دەکەن به ئامراز (لەگەڵ مەزنیی بابەتەکان)، درەنگ و زوو پەشیمان دەبنەوە. نالی دەزانێ شیعر جوانکردنی دنیایە، شیعر له کۆتاییدا بەرهەمهێنانی چێژە، شیعر سێکسە لەگەڵ زماندا، دەزانێ توانای زمان و داڕشتن حیکمەتی گەورەی لێ دەکەوێتەوە:

*نالی عەجەب به قووەتی حیکمەت ئەدا دەکا*
*مەعنایی زۆر و گەورە به لەفزی کەم و بچووك*

جیاوازی نێوان نالی و شاعیرانی دیکە، جیاوازی نێوان زێڕینگر و ماسیگرە، ماسیگر نازانێ چ ماسییەك دەگرێت، تەنیا تۆڕ فڕێ دەدات، بەو واتایەی بە دەست خۆی نییە چ دەگرێت. نالی چەشنی زێڕینگر نەقشی ورد دەکات، بۆیە دەبینین له شیعری بۆ گوێدرێژەکەی و له شیعری بۆ حەبیبەی به قەد یەك خەریك دەبێت، به قەد یەك وردەکاری دەکات. من لێرەدا به پێچەوانەی بۆچوونەکانی (مامۆستای بەهەشتی گیو موکریانی) زۆرم پێ خۆشه نالی شاعیری قەومی نەبووە، شیعری قەومی له شێوەی شیعری کرێکاری، له شێوەی شیعری ئیسلامی، تەنیا یەك ڕەنگی دنیا دەبینێ، ئەم جۆرە شیعرانەش خوێنەر تووشی "عومای ئەلوان" دەکەن! شیعر به هەر چوارچێوەیەك ببەسترێتەوە، باڵی فڕینی دەکرێت. شیعر باڵندەی ماڵیی نییە، بەڵکو ئاسکە کێوییە.

*چ خۆشه من وەکو تانجی بتۆرێم*
*ئەتۆش هەر وەك غەزالەی بەڕ هەر ڕاکەی*

نالی ئەم دوو دێڕەی ئەگەر بۆ یارەکەیشی گوتبێ، ئەوا بۆ ڕوانگەی لەبارەی شیعریشەوە دەگونجێت، نالی قەڵەمی خۆی شووبهاندووە بەو تاژییەی کە دوای ئاسکی شیعر کەوتووە. نالی بە ڕاستی ئیمانی بە شیعری واڵا هەبووە، ئیمانی بەوە هەبووە کە دەکرێت شیعر هەر بابەتێك بکاتە ئامراز (جا با نەتەوە بێت، یا هەژاری، یانیش مێژوو)، بەڵام بۆ ئامانجێك کە هێنانەدیی شیعرییەتە، ئەم هزرەش ئیمانبوونە بەوپەڕی ئازادی لە نووسیندا.

ئەو کاتەی نالی شیعر بۆ پێغەمبەریش دەنووسێت (کە بابەتێکی ڕاستەوخۆ و دیاریکراویشە)، بیری ناچێت بیخاتە ناو یارییەکانی زمان و داڕشتنەوە:

***ئەی ساکینی ڕیازی مەدینەی منەووەرە***

***لوتفێ بکە، بفەرموو: مەدینەی منە و، وەرە***

ئەو نالییەی پێش سەدە و نیوێك لە دەردە نازدارەکانی شیعر و ئەرك و ئامانجەکانی گەیشتبوو، ئەوا بەداخەوە هەنووکەش شاعیری کورد هەیە، سوودی لەو پەند و حیکمەتە شیعرییانەی وەرنەگرتووە! لە ئێستاشدا شاعیر هەیە وا تێدەگا مەزنی بابەت لە شیعردا کەفیلە بۆ دەستەبەرکردنی دەقی مەزن! پێی وایە شیعری ئینسانی ئەوەیە باسی ئینسان بکات و شیعری ڕۆمانسی ئەوەیە باسی جوانی بکات و شیعری بەرگریش باسی ڕۆم و عەجەم! وەهمی دەقی مەزن نزیکی کردوونەتەوە لە هاوتەریبوون لەگەڵ کێشەکانی دەستەجەمعدا، لێرەوە شاعیر لەبری ئەوەی ئەزمونی

زاتی خۆی بنووسێتەوە، دەبێتە ئیمام و خەتیب!

شاعیر دەبێتە پاڵەوان، کە عەیبە بترسێت! عەیبە سێکس بکات!

عەیبە داوای دەوڵەتی کوردی نەکات! کەچی نالی کە لە مەستوورە توورە دەبێ، دەبێتە دکتۆری تەشریحی ژن! وێڕای ئەو هەموو بارگە کۆمەڵایەتی و ئاینییەی کە هەیەتی، خۆی دێنێتە ڕیزی کەرەکەی! چونکە یاخیبوون لە زماندا، یاخیبوون لە مەعنادا دروست دەکات. ئەوە زمانە لە شیعردا ئاقاری نوێی مەعنا دەدۆزێتەوە، نەك بە پێچەوانەوە. نالی دەزانێ شیعر چەشنی سێکس، لە یەك کاتدا تینوێتی و پەشیمانبوونەوەیە، تینوێتییە لەبەر ئەوەی ئومێدی توانەوەیە لە زانین، پەشیمانبوونەوەیە لەبەر ئەوەی ئەو ئومێدە لە وەهم زیاتر هیچی دیکە نییە! بۆیە شیعری باش گەڕان نییە بە شوێن هەقیقەتدا (جا هەقیقەت لای کێیە؟)، بەڵکو گەڕانە بە دوای وەهمدا، تێکشاندنی شتە ناسراوەکان و ڕوانینە باوەکانە، گەڕانە بۆ دۆزینەوەی گەڕەکە تاریکەکانی خود کە هێشتا ئاو و کارەبای زانینیان بۆ نەچووە. لە لایەکی دیکەشەوە زۆرم پێ خۆشە نالی لەسەر شێوەی هەندێ شاعیری تر لەسەر حسێبی زمان و تەکنیك، دینداریکی مەعناخواز نەبووە. ئەگەر مەحوی ویستبێتی خۆی لە دنیا بتوێنێتەوە، شیعر بکاتە ئامرازێك بۆ توانەوەی لە زاتێکی میسالی (کە خوایە)، ئەوا نالی

ئامانجی ئەوەیە دنیا لە خۆیدا بتوێنێتەوە، زاتی خۆی بکاتە چەقی دنیا. نالی دنیا بە خۆی دەپێوێ، نەك بە پێچەوانەوە.



ئەو تەنکە ئاوانەی

بـە ڕووبـار نـاو دەبـرێـن

لە ئەدەبیاتدا ئەوەی قـووڵ بێـت، لە ڕوونـی سـڵ ناکـاتەوە، زۆر جار "ئاڵۆزی"، مەبەستێتی قووڵییەکەی نەبینرێت، یان بیشـارێتەوە، دارشتنی ئاڵۆز وەك ئاوی لیخن وایە، قووڵی دەشـارێتەوە، بـۆچی دەبــێ لە شـــیعرەکانی دادایزمەکـــان بـــگەم، لە شـــیعرەکانی سووریالییەکان بگەم، بەڵام لە شیعری شاعیرێکی کـورد نەگەم؟! وێڕای ئەوەی شاعیرە کوردەکە بە زمانێك دەنووسێت کە زمـانی دایکـمە، شـیعری نـوێ جـێگەی ئەوە نەمـاوە حەشـر و قیـامەت تـێکەڵ بکـات، تـابووت و خـوێن و دوژمـن بخـاتە ڕسـتەی ئاڵۆزەوە، شیاوە مانا ئاڵۆز بێت، بەڵام مەرجە دارشتن ڕوون بێت، نالی بە دارشتنی ڕوون، ئاڵۆزترین و وردترین هەست و دنیـابینی خسـتۆتەڕوو، شکسـپیر هەروەهـا، مـوتەنەبی هەروەهـا، چـونکە یەکەم ئەرکــی زمـــان: گەیانـــدنە، شـــیعری ئێســـتا شـــیعری کۆسمۆپۆلیتی نییە، شاعیر وەك جـاران بەرپـرس نیـیە زەنـگ بـۆ ڕووداوە کەونییەکان لێ بدا، لە سەقافەی گشتی بەرپرسیار بێـت، شاعیر شاعیرە و بەڕێـوبەری شـارەوانیش بەڕێـوبەری شـارەوانی، هەر کەسـە و کـاری خـۆی، ئەو زەمـانە ڕۆیـی شـیعر شـوێنی میتۆدەکان بگرێتەوە، میتۆدەکانی لێ بار بکرێت، حـاجی قـادری کۆیی لەو کـاتەی شـاعیر بـوو ناچـار بـوو میتـۆدی مێـژووش لە شیعرەکانیدا بار بکات و ببێـتە مێژوونووسـیش، ئەحـمەدی خـانی وێڕای شیعر، دەبووایە جێگەی میتۆدی بیـری نەتەوەیـیش لە مەم و زیندا بکاتەوە، فایەق بێکەس، حاجی تۆفیقی پیرەمێرد، دیلان، کامەران موکری، کێی تر؟ جـا کێـی تـر نـا؟ هەموویـان وێـڕای شـــاعیربوون دەبـــوایە تـــوێژەری کـــۆمەڵایەتی و سیاســـی و

مەوعیزەدەر بن، شاعیرانی کورد زۆربەیان شیعریان بۆ شیعر نەنووسیوە، ئامانجیان شیعرییەت نەبووە، بەڵکو هەردەم (جا ناچار بووبن یان نا ) شیعریان کردۆتە ئامرازێك بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی گشتی، بۆ ئەمەش هۆکار زۆرە، ڕەنگە بڵێن جا ئەم کارە مەزن نەبووە؟ بەڵی منیش دەڵێم مەزن بووە، بەڵام بۆ شیعر نا، بۆ هەموو بوارەکانی ژیانی کورد کارێکی ئێجگار مەزن بووە، بێجگە لە بەرهەمهێنانی شیعرییەت. لێرەدا ناچمە ناو وردەکارییەکانەوە، چونکە دەگەینە ئەوەی بپرسین ئاخۆ ئێمە مێژووی ئەدەبمان هەیە، یان مێژووی ئەدیبانمان هەیە؟! چونکە مەرج نییە هەر کاتێك ئەدیب هەبوو، ئەدەب هەبێ. بۆ نموونە لە دەیەی شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا دەیەها شاعیرت هەیە، بەڵام بە دەگمەن شیعرت دەست دەکەوێ. گەر وردتر بدوێین لەبارەی نووسینەوەی ئاڵۆزی بە زمانێکی سادە، ئەوا ناچارم بە کورتیش بێ ئاماژە بە گرفتێکی دیاری شیعری هاوچەرخی کوردی بدەم، یەکێك لە کۆڵەگە سەرەکییەکانی شیعر لادانی زمانەوانییە، ئەوەی "جان کۆهین" ناوی دەنێت (خلیسکانی زمان)، بەو واتایەی لە شیعردا دەتوانیت یاسا و ڕێساکانی قسە و زمان بشکێنیت، ئەمەش بۆ ئەوە بووە کە سەرسوڕمان و ئینبیهاری زمانەوانی لە تێکستدا فەراهەم بکرێت، یان پەیوەندیی تازەی زمانەوانی بدۆزیتەوە، بۆ نموونە شیاوە لە شیعردا بڵێیت (شەوم فڕ کرد) یان (شاخم خواردەوە و... تاد) کە ئەمە لادانە لە یاسا و ڕێسای قسە (کلام) و زمان (اللغة)، لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا لادانەکان و خلیسکانەکانی زمان لە شیعردا

هێنـده دووبـاره و هەزاربـاره کـراونەتەوە، تـا ڕادەیەك خۆیـان بوونەتە بەشێك لە یاسا و ڕێسای زمان، واتا چۆرێك سەرسوڕمان و ئینبیهاریـان لای خـوێنەر نەمـاوە، بـۆ دەرچـوون لەو گـرفتە و بەدەستهێنانەوەی متمانەی خوێنەر، زۆر جار شاعیرانی ئێمە فێڵیان کردووە، بۆ نمـوونە شـاعیرێك کە ناتوانێـت وێنەیەکـی نـوێ لە ڕێی پەیوەندی نوێی وشەکانەوە دروست کـا، دێـت فێـڵ دەکـا، زمان و داڕشتنەکە هێندە ئاڵۆز دەکا تاوەکو تۆپشنەکانی خـوێنەر نەهێڵێت و ئەگەرەکانی ڕەتکردنەوە یـان قبـوولکردن لە خـوێنەر بسەنێتەوە، جاریش بووە فێڵی دیکە لە خوێنەر کراوە، بۆ نمـوونە کە شاعیرێك ناتوانێت سیاقێکی نوێ و چێژبەخش بـداتە وشـەی (خۆرهەڵات) و یەکسەر دەیکـاتە (شـروق) یـان سـپێدە دەکـا بە (فەجر) یان (کەو) دەکـا بە (نەورەس) و تـاد.. بەو وەهـمەی کە خـوێنەر لەو خـۆدزینەوەی شـاعیر نەگـات و سەرسـوڕمانی بـۆ فەراهەم بێـت. ئەم ڕێگایـانە هەموویـان یەکسـانن بە شـێلوکردنی ئەو ئاوە تەنکانەی کە قووڵیی بە خوێنەر دەفرۆشنەوە.



**ئـــەدۆنـــیـــس**

**هێلانەیەك لە دارستانی مەجازدا**

لە ناوەڕاستی مانگی نیسانی ساڵی ٢٠٠٩دا و بۆ ماوەی زیاتر لە هەفتەیەك، شاعیر و بیرمەندی گەورەی عەرەب و جیهان "ئەدۆنیس"، میوانی کوردستان بوو، ئەم هاتنەی خەونێکی لەمێژینەی نووسەران و ڕووناکبیرانی ئێمە بوو، بە تایبەتی کە ئەدۆنیس شیعر و دنیابینییە شیعرییەکانی ماوەی سی ساڵ زیاترە تارماییەکانی ڕوونە بەسەر بەرهەمە ئەدەبییەکانی کوردانەوە، ئەم شاعیرە وێڕای ئەوەی دیارترین ناوی تازەگەر و نوێخوازە لە نێوەندی ئەدەبیی عەرەب و بەرهەمە شیعری و ڕەخنە فیکرییەکانی جێی گرنگی و سەرنجڕاکێشانی ڕووناکبیران بووە. وێڕای هەمووئەمانەش، بە بۆچوونە بە جورئەت و ڕاشکاوەکانیشی دەناسرێتەوە بەرامبەر بە گرفتە هەنووکەییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەر لە بۆچوونەکانی لەبارەی ئایینەوە بگرە، تا دەگاتە بۆچوونەکانی لەمەڕ ژن و ئومێدە ژیارییەکانی ئینسان.

پێش هەموو شتێك، لەبارەی ئەم هاتنەی ئەدۆنیسەوە پێویستە سوپاس و دەسخۆشی ئاراستەی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیری گەلاوێژ بکرێت بۆ سازکردن و ماندووبوونیان و ئامادەکردنی پرۆگرامی سەردانەکە، کە بێگومان بووە مایەی ڕێز و پێزانینی نێوەندە ڕووناکبیرییەکان و ئەدیبانی کوردستان. لەمێژە باس لە گرنگیی کردنەوەی دەروازەکانی کوردستان دەکرێت بە ڕووی ناوە گرنگەکانی ڕووناکبیرانی دنیا و ئاشناکردنیان بە لایەنە ژیارییەکانی کورد و ناساندنی ئەو ئومێد و گرفتانەش کە ئێمە هەمانە.

به هـاتنی ئەدۆنـیس دەلاقەیەك بە ڕووی مـاڵی کولتـووریی ئـێمەدا کـرایەوە. ئەدۆنـیس وێـڕای ئەوەی بێگومـان بـوو کە بە هاتنی بۆ کوردستان دەکەوێتە بەر لێشاوی ڕشانەوەی مەرەکەبـی قەڵەمە شـۆڤینییەکانی عەرەب و تەخـوین دەکرێـت و هەوڵـی ناوزڕاندنی دەدرێت، کەچی سـووربوو لەسـەر نزیکبـوونەوەی لە هەڵەبـجە و گریـانی لە ئەمـنە سـوورەکەی سـلێمانی و جـوینی بنێشتی کوردی لە بازاڕی دەبووەکە، سـووربوو لەسـەر ئەوەی لە نزیکەوە لە شیعر و ئەدەبیاتی کوردی بگـات و وێنە لەگەڵ ئەو گەنجـانە بگرێـت کە بە شـەرواڵێکی شـڕەوە داوایـان دەکـرد ئیعجابی خۆیان بۆ ئەو پیاوە تەرجوومە بکرێت.

مـن بە سوپاسـەوە لەلایەن میوانـدارانی ئەدۆنیسـەوە ڕێـگەی ئەوەم پـێ درا کە لە نـزیکەوە هـاوڕێ لەگەڵ مامۆسـتا نەوزاد ئەحـمەد ئەسـوەد و مـحەمەد نـوری و سـامی هادیـدا یـاوەری ئەدۆنیس بم، لە نزیکەوە ئاگاداری بۆچوونەکانی بـم و گفتوگـۆ و مشتومڕی لەگەڵدا بکەم (کە هەمووشی ئەو تیایدا براوە بـوو)، یەك بە خـۆم لە گەنجێتـیمەوە ئاشـنایەتیم لەگەڵ بەرهەمەکـانی ئەدۆنیسـدا هەبـووە، ڕەنـگە ئەو شـڕە عەرەبیـیەی دەیـزانم یارمەتیـدەرم بووبێـت لەوەی لە نـزیکەوە ئاشـنای لێکـدژییەکانی بـم، ئەو بە نـیفەری و عەبـدولقادری جرجـانی و مـوتەنەبییەوە حەیرانە و لە لایەکی دیکەشەوە سان جۆن پێرس و ئۆکتافیۆ پاز و جـان جینیـێ سەرسـامی دەکـات، قەسـیدەی نەسـر لە بـۆدلێر وەردەگرێت و لای محێدین عەرەبی دەیدۆزێتەوە! ئەو کەسێکە بـۆ بیـری نـوێ و دنیـابینی نـوێ دەژی، قسـەی نـوێی لەبـارەی

شتەکانەوە هەیە، دەتوانێت بە ئاراستەیەکی جیاواز لەبارەی قورئانەوە بدوێت، لە هەمانکاتیشدا باسێکی چڕ لەبارەی دوایین شیعری ئیف بۆنفواوە بۆ بکات! سنوورێك ناهێڵێت بۆ کۆن و نوێ، ئەسڵەن گرنگی بە سنوورەکانی کۆن و نوێش نادات، ئەو شوغلی شاغیلی سنوورەکانی نێوان کۆن و نوێ نییە، بەڵکو سنوورەکانی نێوان جوانی و ناشیرینییە، لە کتێبە نایابەکەیدا (گۆڕاو و نەگۆڕ لە ئەدەبدا) بە درێژی باس لەوە دەکات کە نوێ ئەوە نییە تازە نووسرابێت، نووسین خۆی لە هەناوی خۆیدا تازەیی دەپارێزێت، دەق هەیە کۆنیشە بەڵام هەموو خەسڵەتەکانی نوێبوونەوەی تێدایە و هەمیشە وەك نوێ دەبینرێت و دەخوێندرێتەوە، دەقیش هەیە دوێنێ نووسراوە و وەك کۆن وایە، لای ئێمە زۆر باسی پەخشانە قەسیدە دەکرێت و زۆر بە دەگمەنیش باس لە شێوازی ئەم ژانرە شیعرییە کراوە بە تایبەتی کە ئەدۆنیس یەکێکە لە ڕابەرانی بوارەکە و دیارترین کەسیش بووە لە ناساندنی بە شێوەی تیۆری و پراکتیکی.

بەپێی خوێندنەوە و تێگەیشتنی من پەخشانە قەسیدە زۆر دوورە لە پەخشانە شیعر، ئەمە ئەگەر نەڵێم پێچەوانەی یەکترن. پەخشانە قەسیدە ئەوەیە کە شاعیر لە ناو پانتایی شیعر سوود لە پەخشان وەردەگرێت، هەرچی پەخشانە شیعرە ئەوەیە کە شاعیر لە پانتایی پەخشاندا دەنووسێت و سوود لە شیعر وەردەگرێت، بۆ نموونەی ئەم دوو جۆرەی شیعریش دەبینرێت، محەمەد ماغوت پەخشان دەنووسێت و سوود لە شیعر وەردەگرێت، کەچی ئەدۆنیس شیعر دەنووسێت و سوود لە پەخشان

وەردەگرێت، بە ڕای سادەی خۆمیش ئەو شێوازەی ئەدۆنیس لە قازانجی بەرهەمهێنانی شیعرییەتە، چونکە کاتێک ماغوت لە پانتایی پەخشانەوە سوود لە شیعر وەردەگرێت بە ڕوونی دەق بەرەو ڕاستەوخۆیی و قسەی ئاسایی دەبات (هەرچەندە قسەی بەهێز و سەرنجڕاکێشن و بە ئارەزووی خەڵکە)، بەڵام لە ڕووی نرخی شیعرییەتەوە کەمخایەن و تەمەن کورتن (زیاتر لە نووسینی ئۆپۆزسیۆن دەچێت، کاتێک لەسەر دیوارەکان دژی دەسەڵات دەنووسن)، بەڵام ئەدۆنیس کاتێك لە ناو شیعردا سوود لە فراوانیی پەخشان دەبینێت، بۆ مەبەستی ئازادبوونی دارشتن ئەم کارە دەکات، پەخشان لە شیعری ئەدۆنیسدا وەك ئاوە بۆ شلکردنەوەی قوڕ، تا دواتر شاعیر بتوانێت وەکو کەستەك لە حەرف و وشە نەڕوانێت و زمان ببێتەوە بەو قوڕە شلەی کە شاعیر/خالق لە ڕێیەوە دووبارە شتەکان دروست بکاتەوە، تازەگەری ئەدۆنیس پێش ئەوەی لە مانا بێت، لە فۆرم و تەکنیکی شیعرییە، چونکە خۆی گوتەنی شاعیر هیچ بابەتێکی تازە دروست ناکات (مردن، خۆشەویستی، نیشتمانپەروەری، هتد....) هەموویان وەك بابەت هەبوون، بەڵام شاعیر جۆری تازەی گوتن و دارشتن دەدۆزێتەوە، لێرەوەیە گرنگیی زمان و تەکنیکی شیعری دەردەکەوێت. گرنگیی ئەدۆنیس تەنیا لە بواری شیعریدا قەتیس نامێنێ، بەڵکو دەپەڕێتەوە بۆ کولتوور و ئایین، ئەدۆنیس پێی وایە ئایینی ئیسلامی بۆتە مۆتەکەی سەردلی هەموو شێوەکانی پێشکەوتن و نوێکاری کە بە درێژایی سەدان ساڵ نەتەوەکانی ئەم ناوچەیە ویستوویانە بەرجەستەی بکەن،

ئـایین لە ئیسـلامدا لەبەر ئەوەی لە شـێوەی دەقێکـی نووسـراودا بەرجەستە بووە، پێی وایە دەبێت هەرچی دەقی دیکەیە: لە شـیعر و لە چیرۆك و لە سەرجەم ژانرە ئەدەبییەکـانی تـر، پێویسـتە ببـنە شەرحکەرێکی بە وەفای قورئـان، چـونکە هەرچـی دەقـی دوای قورئـانە پاشـکۆن و خزمەتکـاری دەقە ئاسـمانییەکەن، ئەمەش بە ڕای ئەدۆنیس گەورەترین سووکایەتییە بە بەرهەمە ئینسـانییەکان، هەرچی هەست و نەستی مرۆڤە ئەگەر پاشکۆی قورئـان نەبێـت، ئەوا ناوناتۆرەی ئامادەی بۆ ئامـادە کـراوە، ئەدۆنـیس پێـی وایە هاتنی ئیسلام پێش ئەوەی گورز بێت لە بازرگانەکـانی مەککە، گـورزی لە شـاعیران داوە، یەکەم کـاری ئیسـلام دەرکردنـی شاعیران بووە لە میانەی ڕەوانبێژی و حەقبێژی، هەرچەندە وەحی لە ڕووی مەعـریفییەوە هـیچ گرنگییەکـی نیـیە، لەگەڵ ئەوەشـدا وەحی بۆ پێغەمبەر بووە و شاعیرانیش وەحیان لێ سـەندراوەتەوە و نـاتۆرەی ئەوەیـان بـۆ هەڵبەسـتراوە کە جنـۆکە ئیلهامیـان بـۆ دێنێت، بەمەش هەوڵی ئەوە دراوە کە شاعیران دوژمنـی قورئـانن و دەبـێ تـۆبە بـکەن بەوەی شـیعریان لە خزمەتـی شـەرحکردنی گەورەیی و ڕاسـتیی قورئانـدا تەرخـان بـکەن، لێـرەوە ئەدۆنـیس تەسەوف بە لقێکی ئایین حسێب ناکات، پێی وایە متەسـەوفەکان لە کۆنکریتی شەرعەوە ڕایـانکردووە و لە دەروازەی تەسـەوفەوە ئیـرادەی تاکیـان لە کـۆمەڵی مێگەلئاسـادا گەڕانـدۆتەوە، بـۆیە خـاوەن فیکـرە گەورەکـانی عەرەب لەو پێنـاوەدا دەبینرێـت چەنـدیان بـوونەتە قوربـانی دەسـتی پـارێزەرانی ناسـراو و بـاوی ئایین، چونکە فیکری ئیسلامی پێی وایە قورئان کۆتایی نـوێترین

نوێیە، بەمەش ئیسلام وەستاوە بە وەهمی گۆڕانی هەمیشەیی، کۆنە بە وەهمی نوێگەری، ناسراوە بە وەهمی دۆزینەوە، باوە بە وەهمی شازبوون، ئاساییە بە وەهمی جیاوازی!

تەوەرێکی زیندووی دیکە لە بۆچوونەکانی ئەدۆنیس سەبارەت بە شیعری بەرگری بوو، ئەو پێی وایە هەموو شیعرێکی جوان بەرگرییە، بەڵام ئەو شیعرانەی گرەو لەسەر شۆڕش و نیشتمانپەروەری دەکەن و لە خزمەتی دەسەڵاتدا کار دەکەن، جۆرە شیعرێکن مەرگیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتووە، تەمەنی ئەم شیعرانە بە قەد تەمەنی ئەو دەسەڵاتەن، لەوێشەوە نموونەی مەحموود دەروێش دەهێنێتەوە کە چۆن ببووە موورادیفی کێشەی فەڵەسینی و هەر ڕەخنەیەك لە شیعری مەحموود دەروێش بگیرابا، ئەوا ڕاستەوخۆ ڕەخنە بوو لە کێشەی فەڵەستینی، بەو واتایەی کە جار هەیە شاعیر خۆی دەکاتە بەشێکی جیانەکراوە لە پیرۆزییەکانی وڵات و نەتەوە، واتا شاعیر باشی شیعرەکای لەم حاڵەتەدا پەیوەندی بە شیعرەوە نییە، هێندەی پەیوەندی بەو خۆشاردنەوانەی شاعیرەوە هەیە لە پەنا پیرۆزییەکانی خەڵکەوە، شیعری بەرگری شیعرێکی گرنگە بۆ هێزەکانی بەرگری، بەڵام لە مێژووی شیعردا گرنگییەکی ئەوتۆی نییە. ئەدۆنیس زیاتر لە جارێك پرسیاری کردووە دەکرێ: ناوی شیعرێکی شۆڕشمان بۆ بڵێن لە مێژوودا نەمر بوویێت؟!

ئەوەی پەیوەندی بە کەسایەتیی ئەدۆنیسیشەوە هەبێت و لەو ماوەیەی یاوەری بووم و تێبینیم کردبێت، ئەوە بوو کە چۆن وەکو ئیسفەنج ڕەخنە و تێبینی (هەرچەندە سروشتییش نەبن)

هەڵدەمژێت و بە سینگێکی فراوانەوە قبووڵی دەکات، سەرەتا و لە یەکەم دانیشتندا لە منی پرسی: ڕات بەرامبەر دوایین دیوانی شیعریم چییە؟ (مەبەستیشی لە کتێبی "الکتاب" بوو کە سێ بەرگە و خوێندنەوەی سەختە، چونکە لە یەك لاپەڕەدا چوار پەراوێز شیعر هەیە و پەیوەندیشیان بە یەکەوە هەیە و نییە)، منیش لە وەڵامدا گوتم: ئەم دیوانەم زۆر بە دڵ نەبوو، چونکە هەر هەمووی بریتی بوو لە خوێن و کوشتن و ملپەڕاندن و دۆزەخی تاوان، ڕەنگە لەبەر ئەوەی من عەرەب نیم و ئینتیماشم بۆ ئەو مێژووە نییە، بێدەنگ بوو.. دواتر چووین بۆ ئەمنە سوورەکە و کاتێك نووسینی سەر دیوارەکان و وێنەی قوربانییەکانم بۆ تەرجەمە دەکرد، ئاوڕێکی دایەوە و گوتی ئەوەی بەسەر ئێوەش هاتووە هیچی لە نەتەوەی عەرەب کەمتر نییە، بۆیە داواکارم بچیتەوە جارێکی دیکە کتێبی (الکتاب: امس المکان الان) بخوێنیتەوە، ئەدۆنیس دەیگوت: زۆربەی ڕەخنەگرەکان لەبارەی ئەم دیوانەوە گوتوویانە کە مێژووی ئێمەت بە خوێناویترین شێوە وێنا کردووە و منیش پێم گوتوون ئەمە مێژووی ئێوەیە بێ زیاد و کەم، ئەدۆنیس لەم گەشتەیدا بۆ کوردستان سەدەها تێبینیی ڕۆژانەی سەردان و بینینەکانی تۆمار دەکرد و بە ئاشکرا دەیگوت من هەمیشە خۆم بە دۆستی کوردان لە قەڵەم داوە و لەگەڵ دروستبوونی قەوارەی سەربەخۆیی کوردانیشم، هەرچەندە ئەو لە هەموو ژیانی بە شێوەی پراکتیکی سیاسەتی نەکردووە، بەڵام خاڵی نییە لە دنیابینی سیاسی، پێی وایە هەر ئایدیایەك، ئایینی بێت، یان

ئەتنیکی، یان ناسیۆنالستی، کاتێك دەبێتە ئایدۆلۆژیا، پێویستە ڕووناکبیر بەرامبەری بوەستێتەوە، کاری ڕووناکبیر لای ئەدۆنیس پێچەوانەی کاری سیاسییە، سیاسی دەیەوێت هەموو کۆمەڵگا بکاتە یەك ڕەنگ و خۆی ڕابەرایەتی ئەم ڕەنگە بکات، بە پێچەوانەوە ڕووناکبیر دەیەوێت یەکڕەنگیی کۆمەڵگا بشکێنێت و پارچە پارچەی بکات و بە هۆی فرەڕەنگییەوە و لە ڕێی بەریەککەوتنی ڕەنگە جیاوازەکانەوە کۆمەڵگا پێش دەکەوێت و گەشە دەسەنێت.

وێڕای ئەو ئاشنایەتییە لە مێژینەیەم لەگەڵ شیعر و نووسینەکانی ئەدۆنیسدا، کاتێك ناسیم، ئەو ئاشنایەتییە فریام نەکەوت و لە شێوەی وەهمێك دەرکەوت! من هەمیشە لەگەڵ خۆمدا شانازیم بە ناسیاویتیم لەگەڵ بەرهەمی سێ نووسەر کردووە، یەکیان گارسیا مارکێز بووە و ئەوی دیکەیان ئارتۆر ڕامبۆ بووە و سێیەمیان ئەدۆنیسە، لەم هاتنەی بۆ کوردستان لەیەك کاتدا شادمان و نیگەران بووم! شادمانیم ئەوە بوو کە ئەم شاعیرە دوای ئەو هەموو تەمەنە هێشتا لە توانای دایە چەشنی گەنجێك تازەخواز بێت! لە بۆچوونەکانی سەبارەت بە شێوەکاری، بە شیعر، بە مۆسیقا، بە نیشتمان، بە ژن.. فرێش و نوێ بوو، شادمان بووم کە لە نزیکەوە شاعیر و بیرمەندێکی لەم قەبارەیە ئاشنای نالی و ئەمنە سوورەکە دەبێت و لە چایخانەی شەعب تێبینی لەسەر وێنەکانی عەبدولکەریمی مودەڕیس و شەهید ئارام کۆدەکاتەوە و بە دەم نێرگەلە کێشانەوەش ئەزموونی ئەفراندنی خۆی دەگێڕێتەوە و داوا لە گەنجەکان

دەکات بتە ئەدەبییەکان بشکێنن، چونکە بتی ئەدیب لە بتی دیکتاتۆر ترسناکترە، شەوانیش لە ژوورەکەیدا ئومێد و گرفتەکانی کوردان دێنێ و دەبات.. بە تەوازعیشەوە دەڵێت: لە نووسین زیاتر هیچم پێنییە بۆ بەرگریکردن لە مافەکانتان! ئەوەی نیگەرانیشی کردم ئەو بەراوردە ناچارییە بوو کە بەبێ ویستی خۆم لە نێوان ئەدۆنیس و ئەدیبەکانی خۆماندا دەمکرد، ئەدۆنیس چەشنی ئیسفەنج هەموو ڕەخنە و تێبینییەکی هەڵدەمژت، هێندەی گرنگی بە تێبینی دەدا نیو ئەوەندە ئاوڕی لە ستایش نەدەدایەوە! کەچی لای خۆمان کە ئەدیب دەگاتە تەمەنی ئەدۆنیس هەندێ دینگەی بۆچوونی پەیدا کردووە و دان بە ماڵی هیچ بۆچوونێک دانانێت ئەگەر سەقفی ئەو ماڵە لەسەر دینگەکانی ئەودا نەوەستابێت! ئەدیبەکانی ئێمە کە لە تەمەنی ئەدۆنیسدا بن (ئەنجوومەنی ئەدیبان)یان پێ باشترین کتێبی نەقدییە و تا ڕادەی تووڕەبوونیش بەرگری لەو تابلۆیانە دەکەن کە جامانەیەکی بە خوێن بەسەر تەڵێکی دڕکاوییەوە دەلەرێتەوە! شوغلی شاغیلیان یەکێتی سۆڤیەتی پەنجاکانی سەدەی ڕابردووە و ئێستاش پێیان وایە نالی لەنێوان ساڵانی ١٨٥٦ بۆ ١٨٥٨ کۆچیدوایی کردووە، گوڵ لە شیعری مەولەویدا شوێنێکی تایبەتی هەیە، نەدەبوو مستەفا بەگی کوردی حەزی لە قادر بکردبایە و لەوەش قەباحەتتر ناوی پیرۆزیی کوردی بگۆڕێت بە هیجری! کەچی ئەدۆنیس سەرقاڵی دۆزینەوەی پەیوەندیی نێوان شیعری متەسەویفەکان و شیعری ئۆتۆماتیکییە! تابلۆی دەبینی و دەپرسی ئایا هونەرمەندی شێوەکاریتان هەیە باوەڕی بە بەکارهێنانی

ڕەنگ نەمابێ؟! چونکە ئەو پێی وایە ڕەنگ کائینێکی زیندووە و ئامرازی گەیاندنی بابەت نییە، ڕەنگ ناکرێت لە قسە نزیك بکرێتەوە، بەڵکو پێویستە ڕەها بکرێت، پێی غەدرە ڕەنگ بکرێتە قسە و ئەرکی دروستکردنی وێناکردنی ڕووداوەکان بگرێتە ئەستۆ! من سەرم سوڕماوە لەوەی ئەم شاعیرە چۆن توانیویەتی بەم شێوەیە خۆی بەتاڵ بکاتەوە لە ئوسوڵییەتی شوێن و ئوصوڵییەتی کات، ئینتیمای بۆ سەرجەم جوانییەکانی کولتوورەکەی هەیە و لە هەمان کاتیشدا بێبەرییە لە هەموو دزێوییەکانی مێژووی نەتەوەکەی! چۆن دەکرێت لەو تەمەنە بەرگری لە فیکری ناڕاستی دوێنێی خۆت نەکەیت و هەموو بەیانییەك کاژ فڕێ بدەیت؟ ئەمە چ دەرسێکە ئەم پیاوە بە ئێمەی دەبەخشێت؟ دەرسی بێبەریبوون لە باو بە مەبەستی ڕاڤەکردنی جیاوازی، دەرسی بێبەریبوون لە وەستاو بە مەبەستی گۆڕانی هەمیشەیی، بێبەریبوون لە کۆن بە مەبەستی نوێگەری، بێبەریبوون لە ئاسایی بە مەبەستی شازبوون، دەرسی بێبەریبوون لە ناسراو بە مەبەستی دۆزینەوە.... دۆزینەوەی جوانی، لە مێژووی مرۆڤایەیشدا هەموو جوانییەك یەکسانە بە نەمری.



مستەفا بەگی کوردی

شیعر لە پێناو "فەقێ قادر"دا

بە لای منەوە مستەفا بەگی کوردی یەکێکە لەو شاعیرانەی کە بە درێژایی پەنجا ساڵی ڕابردوو غەدرێکی گەورەی لێ کراوە، بەوەی نیو هێندەی هاوەڵەکانی لە کلاسیکدا ئاوڕی تویژینەوە و ساغکردنەوەی شیعرەکانی نەدراوە، مستەفا بەگ هێندەی لە مەجلیسەکانی ئەدەبدۆستاندا باس کراوە و شیعرەکانی کراوەتە مەقام و گۆرانی، هێندە بوونی لەسەر کاغەزاندا نابینین، تەنانەت دیوانەکەیشی ماوەی نیو سەدە چاوەڕێی لە چاپدانەوە بوو، تاوەکو ساڵی ٢٠١٠ سەر لە نوێ کاك محەمەد مستەفا (حەمە بۆر) کاری لێکۆڵینەوەی گرتە ئەستۆ و لە چاپ درایەوە.

سەیرە، بە ڕای من مستەفا بەگ زۆر لە سالم شاعیرترە و ستایلی شیعرەکانیشی هەناسەیەکی کوردانەتری لە ڕووی زمان و داڕشتن و شیعرییەتەوە تێدایە، کەچی قوتبە گەورەکانی نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردوو، لە ساغکردنەوەی ئەدەبیاتی کوردی لە شێوەی بەهەشتییان (مەلا گەورەی مودەڕیس و مەسعوود محەمەد و سەجادی و.. تاد) وەکو پێویست بە شوێن مستەفا بەگەوە نەبوون، تەنانەت زۆر جار ناو و ناتۆرەیشی لێ نراوە (جا بە ئەنقەست بوویێت یان هەر ئەوەندەی تێگەیشتبن) تا سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکیش، تاکە سەرچاوەی لەخۆگری شیعرەکانی کوردی، تەنیا ئەو نامیلکە کەسکەتێرە بەرگ دڕاوە بوو، کە پێش زیاتر لە نیو سەدە بەهەشتی گیو موکریانی لە چاپی دابوو، لەو نامیلکەیەشدا گیو لە سۆنگەی نەتەوەییەوە پێشەکییەکی بۆ نووسیوە کە تیایدا چەندین قسەی نەشیاو بە مستەفا بەگ دەڵێت، لەوانە کە نەتەوەیی نەبووە و بە

شوێن هەتیوێکەوە بووە و کاکۆڵی فەقێ قادری بە نیشتیمان نەگۆڕیوەتەوە و ناوی پیرۆزی کوردی گۆڕیوە بۆ هیجری و تاد...!

مستەفا بەگ بە ڕاشکاویی یان بە پێچوپەنا شیعرەکانی زۆربەی بۆ فەقێ قادر نووسیوە، لەو پێناوەشدا، لە نووسینی شیعردا تووشی زۆر گرفتی تەکنیکی بووە (کە ئامانجی ئەم وتارە کورتە شیکردنەوەی لایەنێکی ئەو گرفتە تەکنیکیانەیە) و بێگومان دەشکرێت ئەوە هەڵێنجین کە دوچاری زۆر گرفتی کۆمەڵایەتی و سیاسیش بۆتەوە بەوەی کەسێکی نزیکی دایەرە و بنەماڵەی حاکمانی بابان بووە، کەچی بە داخەوە ئەوانەی لەبارەی کوردییەوە دواون و نووسیویانە، دوور و نزیك باسیان لە قادر نەکردووە (بە کاك حەمە بۆریشەوە)، وەك ئەوەی بەرگرییەك بێت لە ئەخلاقی پاکی مستەفا بەگ و بە خەیاڵی خۆیان پەرێزپاکیی مستەفا بەگ دەسەلمێنن، لە کاتێکدا پەیوەندیی نێوان مستەفا بەگ و فەقێ قادر خاڵی بەهێزی شیعرەکانی ئەو شاعیرەیە.

سەیرەکەش لەوەدایە کە مەلایەکی وەکو مستەفا بەگ پێی نەنگی نەبووە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە، شیعر بۆ فەقێ قادر و جوانیی فەقێ قادر و حەزی بۆ فەقێ قادر بنووسێت، کەچی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستدا لێکۆڵەوەرەکان پێیان نەنگییە ئاماژەیەکی پێ بدەن (لەوەش زیاتر لە ٢٠١٠یش کاك حەمە بۆر پێی نەنگییە بڵێت مەلا مستەفا بەگی ساحێبقران عاشقی

فەقێیەکی بووە، لەگەڵ ڕێزی بێ پایانم بۆ ئەرك و شەونخوونی و ماندووبوونەکەی).

لە ڕاستیدا گەر ئاوڕێکی خێرا لە دنیابینیی ئەو بەڕێزانە بدەینەوە کە خەریکی کۆکردنەوە و بەرهەمی شاعیران بوون (مامۆستا مەسعوود محەمەدی لێ دەرچێت)، ئەوانەی دیکە هێندەی بە شوێن شاعیرەوە بوون، ئەوەندە بە شوێن شیعرەوە نەبوون، من دێڕێکی مامۆستایان محەمەدی مەلا کەریم و دکتۆر کەمال فوئاد و عەلائەدین سەجادی و چەندین بەڕێزی دیکەیشم نایەتەوە یاد لەبارەی شیعرییەت و تەکنیکی شیعرەوە نووسرابن! وێڕای ئەوەی ئەم زاتانە هەموویان جێگەی تەقدیرن و ماندووبوونیان بەهایەکە لە نرخ نایەت، بەڵام دەبێت ئەوەش بگوترێت کە هەموویان بەشدارن لە نەبوونی دیدێکی ئیستاتیکیانە بۆ شیعر و شیعرییەت، دیارترین جیاوازی لە نێوان نووسینەکانیاندا جیاوازییانە لەبارەی ساڵی لەدایکبوونی شاعیرانەوە، هەر کەسە و لەخۆیەوە ساڵێکی هێناوە و کردوویەتی بە کرۆکی نووسینەکەی، بێ ئەوەی پێشمان بگوترێت بۆچی ساڵەکەی خۆیان ڕاستە، پێشمان ناڵێن بۆچی ساڵەکەی کەسێکی دیکە هەڵەیە؟! ئەوانەی لەبارەی مستەفا بەگەوە دواون، هێندەی بە شوێن ڕاستکردنەوەی ئەخلاقی شاعیرەوە بوون، ئاگایان لە وردکردنەوەی ئەو ئەخلاقە نەبووە کە خودی شیعر هەیەتی! هێندە گرنگ بووە بسەلمێنن کە مەلایەکی ناوداری کورد لە سەدەی نۆزدەدا هەتیوباز نەبووە، هێندە لایان مەبەست نەبووە و پێش دەچێت توانای ئەوەشیان

نەبوویێت کە ئاخۆ ئەو نێربازییە چ کـارگەرییێکی پۆزەتیـف یـان نێگەتیفی بەسەر شیعرەکانەوە هەبووە؟!

شـیعر پـێچەوانەی هەر ژانرێکـی ژیـاریی دیـکە، پێویسـتی بە دوورکەوتنەوە لەو ئەخلاقە هەیە کە مەحکوومە پێـیەوە. دوور لە بۆچوونی کەسێتیی و تایبەتیم، لە هەر ژانرێکی ژیانـدا چەنـدە لە ئەخلاقـی کـۆمەڵ و دەسـتەجەمعیدا نزیـك بکەویـتەوە، هێنـدە بە ماقوڵی و ڕێکوپێکی پێشوازی دەکرێـت، تەنیـا شـیعر نەبێـت کە مەحکوومە بە ئەخلاقی گشتی زمـانەوە، بەشـێوەیەك کە چەنـدی ئەو ئەخلاقە زمانەوانییە تێك بشکێنێت و لێیەوەی دوور کەوێتەوە ئینجـا دەبێـتە شـیعرێکی بـاش، ئەوەی مسـتەفا بەگ تووشـی نەهامەتی دەکا ئەوەیە لە شیعری کلاسیکدا یاسا و ڕێسا هەبووە، میکـانیزمی بـاوی لێکچوانـدن و پێشـوبهاندن هەبـوون، لێـرەوە داڕشتنی قـادر و توانـدنەوەی قـادر لە غەزەلـدا بـۆ مسـتەفا بەگ گەورەترین نەهامەتی دێنێت، خۆشبەختانە بۆ ئێمەی خـوێنەریش ستایلێکی جیاواز و ناوازە لە شیعردا دەخولقێنێت.



# هێمن موكریانی و
# كـــورتـــیـــی تـــەمـــەن

ئەزموونە گەورەکانی ئەدەبیات دەیسەلمێنن کە نووسەری باش ئەوانەن پێیەکیان لە ئێستایە و پێیەکی دیکەیان لەناو ڕابردوودایە، نوێگەری لە هەسارەیەکی دیکەوە نایە، بەڵکو لە هەناوی کولتووردا هەڵدەقوڵێ، من تەنیا عەرەبییەکی هاکەزایی دەزانم و دەتوانم لەوێوە نموونە بهێنمەوە، کاتێك شیعری ئەدۆنیس دەخوێنیتەوە هەست دەکەیت بابەتە هەنووکەییەکان بە داڕشتنێك دەپێچێتەوە کە لە نیفەری و موتەنەبیەوە دێت، هەردەم لەگەڵ کولتووری خۆی ئاشنا و دراوسێیە، مارکیز تا مردیش نەیشاردەوە کە پێش جلوبەرگەکانی دەبوایە یەك دوو کتێبی بەلزاك لە جانتاکەی بوایە، تا ئەو ڕادەیەی زۆرێك لە ڕەخنەگران تا ئەخیر پێداگرییان لەوە دەکرد ڕۆمانی (سەد ساڵ تەنیایی) لە بەلزاکەوە وەرگیرابێت.

ئەم پێشەکییە سواو و زانراوەم تەنیا بۆ ئەوە بوو بپرسم ئاخۆ بۆ لە زۆربەی شیعری ئێستای کوردیدا لە داڕشتن و بەکاربردنی زماندا ئەو هەستەمان نییە کە پێیەکیان لە ئێستا و پێیەکیان لەناو کولتووردایە؟! بە تایبەتی لای شاعیرە لاوەکان، کە ڕاستە وشەکانیان هەمووی کوردین، بەڵام داڕشتنیان کوردی نییە. جاران حاجی تۆفیقی پیرەمێرد و عەبدوڵڵا گۆران و چەندانی تر لە نامە و قسە و شیعرەکانیاندا زۆربەی وشەکان عەرەبی بوون، بەڵام ڕێزمان و داڕشتنیان کوردی بوو. ئەی ئێستا بۆچی هەموو وشەکان کوردین و کەچی ڕێزمان و داڕشتن عەرەبییە؟!

بۆچی دەبێ لە ساڵانی پەنجا و شەستەکانی سەدەی ڕابردوو ڕووناکبیر و شاعیرانی ئەوسای وەکو عەلائەدین سەجادی و

حەسەن قزلجی و هەژار و هێمن موکریانی و زەبیحی و مەلا کەریمی مودەڕیس و چەندانی تر لە گەنجێکی ئەم سەردەمە باشتر کوردی بزانن و بنووسن؟! ئەم پرسیارە پێش هەموان وەك لایەنگرێکی ئەدەبیات بۆ خۆشمە، لە کاتێکدا ئەوان نە خوێندنیان بە کوردی بووە و نە بە دیار سپلیتی دوو تەن و نیوی خوێندویانە و نووسیویانە؟! باشە خۆ ئەگەر عەرەبێك یان فارسێك دەرەقەتی خوێندنەوەی کولتووری هەزارساڵە نایەت، خۆ کوردێك دەرەقەتی خوێندنەوەی کلاسیکێك دێت کە هەموو تەمەنی ناگاتە سەدە و نیو؟ هەموو تەمەنی ئەرشیف و بڵاوکراوەکانی لە سەدەیەك تێناپەڕێ، کێ باوەڕ دەکا مەحوی لە سەرەتای سەدەی بیستەوە کۆچیدوایی بکا و وانەی داڕشتنی لێ وەرنەگیرێت؟!

نابێ نکوڵی لەوە بکەین کە نەوەی من و پێشە منیش بە هەڵە لە نوێگەری گەیشتبووین، هەمووی نا، بەڵکو بەشێکی زۆری پێی وا بوو دابڕانی مەعریفی و نوێگەری واتای دابڕانە لە کولتوور و شێوازەکانی بەکاربردنی زمان، گەر بە هەڵەیش نەچووبین ئەوا دەرەنجام هەر وا دەرچوو. ڕەتکردنەوەی کۆن و هێنانە کایەوەی تازەگەری بە سوودوەرگرتن دەبێت لەوەی نووسراوە، نەك بە ڕاکردن بەرەو ئەوەی نەنووسراوە. من بیرمە جاران لایەنگیریی ئەو گلەییەم دەکرد کە چۆن دەکرێت لە سەرەتای ساڵانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو ڕازی بین بەوەی شاعیرێکی وەك هێمن موکریانی بە ستایلی کێشی پەنجە شیعری قافیەدار بنووسێت؟! بەبێ ئەوەی بێینە سەر باسی زەردێنەکانی

گلەیی قەپێلکمان دەکرد، تەنانەت بیرمە لەو چاوپێکەوتنەی مامۆستا شێرکۆ بێکەس لە شاخ کردی هەمان ڕەخنەی لێ دەگرێت، کە شیعرەکانی هەناسەکورتن و بە شێوازی کۆن نووسراون. ئێستا کە سەدبارە دەیخوێنمەوە دەزانم چ غەدرێکمان لەو پیاوە دەکرد، چەند ناوازە شیعریەتی لە زمانە بەستەزمانە کوردییەکە دروست دەکرد، لەم ئاژاوەی نووسینەی ئێستاوە بیری زمانە پاراوەکەی دەکەین، وەك چۆن ئێستا لەناو عەرەبدا بیری زمانەکەی جەواهیری دەکەن، بێگومان لایەنگیری گەڕانەوەی ستایلی نووسینی مامۆستا هێمن نیم و ناشکرێ ئەو قۆناغە دووبارە بکرێتەوە، چونکە ئەمە دژی سەیرورەی ژیانە، بەڵام خۆ دەکرێ شاعیران سوود لەو شێلانەی ببینن کە زمان و مانای دەکردە هەویر.

ئەوەندەی ئاگاداری ئەدەبیاتی کوردی بم، کەس هێندەی مامۆستا هێمن هەستی بە کورتیی تەمەن نەکردووە، ڕەنگە بڵێن هەموو شاعیرانی کلاسیك باسیان لە پووچیی ژیان کردووە، ئەمە ڕاستە، بەڵام زۆربەی شاعیران لە باری ئایینییەوە لە پووچیی ژیانیان ڕوانیوە، پووچیی ژیان لای شاعیران لەوەوە دێت ئەو بابەتە بە ڕوونی ئایەتی قورئانیی لەسەر هاتووە کە دنیا و ژیان شتێکی کاتییە و خۆشییەکی کەمە. لای مامۆستا هێمن کورتیی تەمەن لە ئایینەوە نایەت، خەمێکی دنیاییە و هەر ئەمەیش گرنگی کردووە، جیاوازیی هەستکردنی مامۆستا هێمن لەگەڵ شاعیرانی دیکە لەبارەی کورتیی تەمەنەوە، زۆر لەو جیاوازییە دەچێت کە شارەزایانی مۆسیقا لەبارەی مۆسیقای فارسی و

تـوركی دەیلێـنەوە، مۆسـیقای فارسـی چـاوگەکەی کارەسـاتە، کارەسـاتی کوشـتنی حوسـەین، کولتـووری غەدری مێژوویـی بەسـەریدا زاڵە، تاریـك و پـڕ لە هـاواری کـردووە، جیـاواز لە مۆسـیقای تـورکی کە خەمێکـی دنیـاییە و بە کـورتترین مەودا زۆرترین چێژ ببەخشـێت، چـونکە مێژوویش دەیسـەلمێنێ ئـایین لای تورکەکان بەرژەوەندی بووە و دنیاییە، لای فارسەکان ئایین وێرانکردنی ڕابـردووە و حوسـەین بیـانووێکە بـۆ گریـان، لێـرەدا خەمی هێمن موکریانی لە خەمی مەقامبێژە عێراقییەکان دەچێـت، مەقـامبێژی عێراقـی وەکـو گەنجێـك بـۆ نـاو دەرکـردن دەنـگ هەڵنابڕێـت، گرنگـی بە دیمەنـی کەسـی نـادا، ڕەنـگە قژیشـی دانەهێنێـت کاتێـك دێـتە سـەر شاشـەی تەلەفزیـۆن، بـۆ خەمـی جێهێشتنی هەموو شتەکان گۆرانی دەڵێ، لە خەمی ماڵئاواییکردنە لە هەموو شتێك، ئەمەش مانای بێزکردنەوە نییە لە دنیـا و ژیـان، وەك چۆن شاعیرە موسڵمانەکان دەیـانکرد، ئەمە مانـای ئەوپەڕی ڕێزگرتنە لە چێژ و خۆشییەکانی زیندووبوون، هەستکردنی هێمن موکریـان بە کـورتیی تەمەن نەك پەیوەنـدی بە ئـایینەوە نەبـووە، هەندێ جار لە زانستیشەوە دوور بووە:

*بە تۆ چاری چلۆن دەکرێ دەروونی پڕ لە ناسۆرم*
*خەساری بۆ دەکەی دکتۆری زانا مەرهەمێکی تر؟*



## گـۆران و
## خلیسکانی زمان

لەبارەی گۆرانەوە زۆر نووسراوە و زۆر گوتراوە، لە ڕاستی دوور ناکەوینەوە گەر بڵێین لە نیو سەدە زیاتری ڕابردووی لێکۆڵینەوە ئەدەبییە کوردییەکان، زیاتر لە زۆربەی شاعیران عەبدوڵڵا گۆران بەسەرکراوەتەوە، بەڵام هەتا ئێستاش کەس نەیگوت و ڕوونی نەکردەوە کە گۆران بۆچی و بە چی لەناو کایەی ئەدەبیی ئێمەدا تا هەنووکەیش زیندووە؟ زۆربەی ئەو لێکۆڵینەوە و توێژینەوانەی لەبارەی گۆرانەوە نووسراون، تەنها دەتوانن بڵێن نوێخواز بووە و کێشی شیعری کوردی لە کێشی فەراهیدییەوە گواستەوە بۆ کێشەی پەنجە! بەمەش ئەو قسەوباسە ئەکادیمی و نائەکادیمییانە نەچوونەتە سەر باسی خاڵی بەهێزی گۆران، نەک هەر ئەوە، بەڵکو خاڵی بەهێزی گۆرانییان زۆر جار وەکو خاڵی لاوازی گۆران نیشان داوە.

لەلای زۆربەی توێژەر و ڕەخنەگران خاڵی لاوازی شیعری گۆران لەوەدایە کە زمانی شیعریی سادەیە و زۆر جار لە ئاستی قسەدایە، یان ئەگەر زۆر خاترییان گرتبێ دەڵێن فۆتۆگرافەرە.

من پێم وایە ئەو سادەیی و ڕوونییە خاڵی بەهێزی شیعری گۆرانە، کە بەداخەوە دوای گۆران بە تایبەتی لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو تەوژمی بەکارهێنانی وەسفی زەینی و ئاڵۆزیی لە دەربڕیندا، بووە پەتایەکی درێژخایەن و تا ئێستاش ئەو پەتایە بەرۆکی زمانی شیعریی بەرنەداوە.

جان کۆهین لە کتێبە ناوازەکەیدا (بونیادی زمانی شیعری) باس لە سێ جۆر زمان دەکات:

یەکەم: زمانی گشتی، کە تیایدا هەر وشەیەک یەک مانا هەڵدەگرێت، واتا بەرد تەنها بەردە.
دووەم: زمانی ئاخاوتن یان قسە، تیایدا بەپێی ئەو گرێبەستە نادیارە کۆمەڵایەتییەی لەنێوان بەکاربەرانی ئەو زمانەدا هەیە، هەر یەکە و ئازادانە وشە و دەستەواژەکان لەناو زمانە گشتییەکە هەڵدەبژێرێت، بەو مانایەی ئاخاوتن یان قسەکردن مامەڵەیەکی ئازادانەی تاکە لەناو زمانە گشتییەکە.
سێیەم: زمانی شیعری، کە تیایدا دەتوانرێت ئەوەی لە زمانە گشتییەکە و ئاخاوتندا ڕێگەپێدراو نییە، ئەوە لە زمانی شیعریدا ڕێگەپێدراوە، بۆ نموونە: لە شیعردا جیاواز لە گرێبەستە کۆمەڵایەتییەکان، زمانی شیعر دەتوانێت بڵێت: تریفەم فڕ کرد، یان هەتاوم خواردەوە.
بە ڕای کۆهین یەکێک لە خەسڵەتەکانی شیعر، ئەو خلیسکانەیە لە زمان بە مەبەستی بەرهەمهێنانی سەرسوڕمانیی خوێنەر و بردنی زمان بۆ ئەوپەڕی دۆزینەوەی مانای نوێ.
گۆرانی شاعیر زۆر جار بەبێ بەکارهێنانی ئەو کۆڵەگە سەرەکییەی زمانی شیعری، توانیویەتی شیعر بنووسێت و نیو سەدەیشە لەناو ئەدەبیاتی کوردیدا ئەو تێکستانە جوان و زیندوون:

جادە چۆڵ و سێبەر بوو کاتی بەیانی
ئەڕۆیشتم خەیاڵاوی ئەمڕوانی
بۆ سەوزایی دەوروپشتم بۆ ئاسمان
بۆ شاخی بەرز خانووی تازە دنیای جوان

ئەمە و دەیان نموونەی دیکەی جۆرە تێکستێک کە بەبێ بەکارهێنانی خلیسکانی زمان و دوورکەوتنەوە لە ئاخاوتن، گۆران شیعر دەنووسێت..

لە گەنجیمدا کاتێک شیعری کوردیم دەخوێندەوە، بە تایبەتی شیعری شێرکۆ بێکەس و لەتیف هەڵمەت و تەنانەت شاعیرانی هەشتاکانی هەولێریش، زمانێکم لە شیعردا دەبینی، لە هیچ شوێنێکی ژیانمدا ئەو زمانە نەبوو، بۆ نموونە شیعر پڕی بوو لە وەسفی زەینی و پەیوەندی بە ئینسانەکانەوە نەبوو، بۆ نموونە ڕستەی لەم شێوەیە دنیای تەنیبوو: تۆ درەوشانەوەی پڕشنگی تریفەی شەوگاری شیعرەکانمی و هتد.. شاعیرم دەبینی لەناو چلپاوی کۆڵانەکانی کوران و تەیراوەدا باسی لە پەپوولە و نەورەس دەکرد.. ئەو کاتە باوی ئەوەبوو ئەگەر کەس لە شیعرێک نەگەیشتبا، ئەوە شیعرێکی نایاب بوو، خوێنەر و تێگەیشتن و چێژوەرگرتنی خوێنەر لە فەرهەنگی نووسەراندا نەبوو، دواتر زانیم کە ئەو شاعیرە ئاڵۆزانە تەنها بۆ ئەوەی ئاستی شاعیربوونیان نەزانرێت، پەنا دەبەنە بەر ئەو ئاڵۆزییە، وەک چۆن لە منداڵیماندا کە نوشتەی شێخ و مەلاکانمان بە دزی دایکمانەوە دەکردەوە و دەمانبینی تەنها هەندێ وشەی بێمانا نووسراون و هیچ واتایەک ناگەیەنن، چونکە واتاشیان نەدەگەیاند بۆیە پیرۆز بوون، یان ناچار بووین بە پیرۆزی بزانین.

لەگەڵ هەبوونی ئەو زمانە شیعرییە درێژدادڕە نوشتەگەراییە، پرسیارێکی سادەم هەبوو: باشە ئەو زمانە شیعرییە لە کوێی ژیاندایە؟! دایکم دەبینی قەت بە منی نەدەگوت بۆ نموونە: تاڤگەی سەرمەدیی فەجری خەونەکانم بۆ درەنگ هاتیەوە! لە

نێوان منداڵ و دایک، کڕیار و فرۆشیار، کچ و کوڕ، لە تەعزییەکان، لە ئاهەنگەکان ئەو زمانەم نەدەبیست، چۆن دەکرێت زمانێک بەناوی ئەندێشەی ئینسانەوە لە ئاسمان وەک عەلاگەیەکی ڕەش بخولێتەوە؟! دواتر کار لەوەش نەما، بەڵکو لای هەندێ شاعیر زمان ئامرازی گەیاندنیش نەما و بە هیچ جۆرێک لە شیعر نەدەگەیشتی، دادایەکانم دەخوێندەوە تێدەگەیشتم، سوریالییەکانم دەخوێندەوە تێدەگەیشتم، ئەدی خێرە لە نووسەرێکی سێتاقان ناگەم؟! گەر تێنەگەم چۆن چێژی لێ ببینم؟!

پرسیارێکی سادە: ئایا دەکرێ شاعیرێک بۆ ماوەی چل ساڵ بنووسێت و دێڕێکی دڵنەوایی گەنجێک نەداوەتەوە کە تەعین نەبووە؟ دەکرێت شاعیرێک خۆی بە بیگ برازەری شیعری کوردی بزانێت و دێڕێکی نەچێتە ناو نامەی کوڕ و کچێکی عاشقەوە؟! ئەو هەموو نەهامەتییەی جیهان هەبێ و تۆش سەرقاڵی دێڕە ئەفسووناوییەکانی خۆت بیت!

لێرەوەیە "گۆران" دەمێنێتەوە، چونکە گۆران بە زمانێکی سادە و نزیک لە ئاخاوتن دەدوێ، شیعر لای ئەو تەنها یاریی زمانەوانی نییە، بەڵکو وێڕای ئەوە تۆمارکردنی هەستەکانە بەو شێوەیەی کەسێک لە بازاڕدا پیاسە دەکات و لەبەرەخۆیەوە قسە دەکا، هاوتاکردنەوەی زمانی شیعری لەگەڵ ئەو زمانەی ئینسان لەگەڵ خۆیدا دەدوێ، گەیاندنی بە پلەیەکی هونەری، نهێنی مانەوەی گۆرانە.. تا ماویشە ئێمە لەبەرخۆمانەوە لەگەڵ خۆمان دەدەوێن، هەر بۆیەشە مانەوەی گۆران زەمەنێکی درێژ دەخایەنێت.



"نالی"ی دۆڕاو و

"حاجی قادر"ی براوه

ئایا هونەر گرنگترە یان ڕووداو؟ جا ئەو ڕووداوە سیاسی بێت یان مێژوویی؟ ئایا ڕووداوی جەنگی جیهانیی دووەم کۆتایی نەهات؟ ئەدی بۆ تابلۆی ژێرنیکای پیکاسۆ تا ئێستاش گرنگییەکەی وەکو جاران ماوەتەوە؟ شەڕی تورك و گریکەکان نەچووە ناو لاپەڕەی کتێبان و لەسەر ڕەفەی کتێبخانەکان تۆزی لەسەر نەنیشتووە، ئەدی بۆچی زۆربا و مەسیح جارێکیتر لە خاچ دەدەرێنەوە و براکوژییەکەی نیکۆس کازانتزاکی ئێستاش چاپ دەکرێنەوە؟! هونەر بە ئەدەبیاتیشەوە مردووی ناو گۆڕی واقیع نییە، واقیع لەناو ئەدەبیاتدا زیندوو دەمێنێتەوە، گەر لە هونەر و ئەدەبیاتی کوردیش بپرسین، ئەوا تاکوتەرا نەبێت دەنا ئەسیر و موفتەنی واقیعە، دووبارەی دەکاتەوە، دەیجوێتەوە، دەیتفێنێتەوە، بۆیە کەم جار دەتوانین ئاماژە بە واقیعیٔ هونەری و ئەدەبی کوردی بدەین، چونکە زۆربەی ئەوەی هەمانە هونەر و ئەدەبی واقیعن. ئەدەب دەبێت ترسناك بێت، بۆ سەر مێژوو، بۆ سەر دەسەڵات (بە دەسەڵاتی زمان و بیرکردنەوەیش)، بۆ سەر واقیع. ئەوەی هەمانە زۆربەی دەستەمۆیە، بۆ بن مێژوو، بۆ بن دەسەڵات (بە دەسەڵاتی زمان و بیرکردنەوەیش)، بۆ بن واقیع.

لەگەڵ هاتنی هەر ڕووداوێکدا هەرچی بەکاربردنی زمان لە نێوەندی ئەدەبیاتدا هەیە دەبنە پاشکۆ، لاریم نییە لە بەکاربردنی ڕووداو (خۆ تابلۆی ژێرنیکای پیکاسۆش ڕەنگدانەوەی ڕووداوێك بوو)، بەڵام بەبێ بوونی گەیاندنی بە ئاستی هونەری ئەوا دەکرێ بیخەینە ڕیزی بەکاربردنەکانی دیکەی زمان، وەك گوتار و هەواڵ و ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەوانی (کە بێگومان ئەمانە

باشــتر لە ئەدەب و هــونەر دەتــوانن ڕووداو بگێــڕنەوە). ئەم پاشــکۆبوونەی هــونەر و ئەدەب بــۆ ڕووداو و ئەو ڕاکشــانە بــێ جــووڵەیەی نــاو تــابووتی واقیــع، هــونەر و ئەدەبیــاتی کــوردی کــردۆتە یــاریی مــاروپەیژە (دەیــان ســاڵە شــاعیر و هونەرمەنــدی شێوەکار هەن) دەیانەوێت ئاستی هونەر و ئەدەبیاتی کوردی یەك-دوو لیڤــڵ بەرز بــکەنەوە بەر ســەری مــاری ڕووداوێــك دەکەون و بەرەو ســاڵانی حەفتاکــانی ســەدەی ڕابــردوو خلــۆر دەکرێنەوە، یان دەبێ بە هەناسە ســوارییەکانی ئەوســای پەشــێو و لەتیــف هەڵــمەت و شــێرکۆ بــێکەس بنووســن، یــان هەمــوو تێکســتەکانیان لە چەکــمەجە هەڵبگــرن تــا مەســەلەی ســواری عەشایری نەینەوا یەکلا دەبێتەوە.

لەم هاوکێشــەیەدا تەنیــا نــالی و نوێخوازەکــان زەرەرمەنــدن، چــونکە نــالی ڕابــردوو نییە، زۆرجــار تێکســت هەیە لە ڕابــردوو نووســراوە، کەچــی وەك ئەوە وایە لە دوارۆژەوە بێــت. حــاجی قادری کۆیی و ئەسیری و پەشێو و هەڵمەت تیایــدا بــراوەن، ئەو تێکستانەی لە ئێستادا دەنووسرێن و لە گۆڕی واقیعدان ئاییندەیان نییە، چونکە زادەی ڕابردوون، ترسناك نین، سنوورەکان نابەزێنن، لەگەڵ کۆمەڵگا و نەتەوە تەبا و بــێ پرســیارن، مەفتــوونی وەڵامە ئامادەکــانن. ئەدیــب و هونەرمەنــدی ڕاســتەقینە پــێش ئەوەی بە دوای نەتەوەوە بێت، پێویستە بە شوێن ئینسانەوە بێت، دەنا چەنــد ســاڵە ئــێمە بەدیــار دیمەنەکــانی کــوژرانی منــداڵانی ســووریا و ســۆماڵەوە دانیشــتووین و پرتەقــاڵ پــاك دەکەیــن و ســێو قــاش

دەکەین، بۆچی ئەو ئەدیبانە جەستەی بە قیمە کراوی ئەو منداڵە بێگوناهانەیان نەکردە ناو تێکستێکی واقیعییەوە؟!

بۆ دەبێ هەردەم هونەر و ئەدەبی کوردی هەمان ڕۆڵی ئەو خەونکوژە ببینێت کە ڕووداوە سیاسییەکان دەیسەلمێنن؟! ئەلفوبێی ئەدەبیات بەرهەمهێنانی جوانییە (جوانی لە دەربڕین و بیرکردنەوە)، بۆ دەبێ شاعیر بڵێت با دوو ئەنفالیتر ڕووبدات بەڵام ببینە دەوڵەت؟! ئایا دەوڵەت پەنجەی دۆشاومژەیەکی منداڵێك دەهێنێت؟! چۆن دەکرێت ئەدیب بە زمانی سواو و زانراو و باو و چەندبارە لە دوارۆژ بدوێت؟ زمانی تەقلیدی و بیرکردنەوەی تەقلیدی و دارشتنی تەقلیدی ئایندەی پێ دەنووسرێتەوە؟ ئەو دەستەمۆییەی هەندێ ئەدیب و هونەرمەندانی کورد بەرامبەر بە شۆڕشی چەکداری و بە شۆڕشی سیاسی ڕەنگە لەوەوە بێت کە هۆشیاریی ئەوەیان نەبێت ئەدەب و هونەریش شۆڕشی خۆیان هەیە، نەك هیچی کەمتر نییە لە شۆڕشەکانیتر، بەڵکو زیاتریشە، چونکە وەك دووکایەی گرنگی ڕۆشنبیری هەردەم هاوکێشەی بە ئاکام گەیاندنی شۆڕشەکانن، هەر ئەو هەوڵە لەرزۆکانەش بوونەتە هۆی ئەوەی ئەدەب و هونەری کوردی پەراوێز و پاشکۆی سیاسەت و سیاسییەکان بن، چونکە سەرخستنی بابەت و ڕووداو بەسەر نرخی هونەریدا خزمەت بە ئامانجی سیاسەت و سیاسییەکان دەکات، بۆیە دەبینین کەم سیاسیی کورد هەیە کەیفی بە هونەر و ئەدەبیاتی نوێگەر و نوێخوازەکان بێت، بەتایبەتی ئەدەبی لاوەکان، چونکە

جوانی و بەهای ئینسان لەژێر تـایتڵە گشـتی و دەسـتەجەمعییەکان ناشارنەوە و نەتەوە تەیار و ئامادە ناکەن بـۆ ئەو شـەڕانەی تیایـدا ژیان، هەموو ژیان تەئجیل دەکەن.



ئەحمەدی شاملوو

دەستێک لەناو ئاوی جوانی و

دەستێک لەناو ئاگری خوێنەر

دوای ئەو هەموو ساڵە (سەدان ساڵ): (لە وەرگێڕانی تەورات و ئینجیل و قورئان، هۆمیرۆس و ڤەرجیل و ئۆڤید، دانتێ و محێدین بن عەرەبی و ئەبی حەییانی تەوحیدی و بۆدلیر و ئەدگار ئالان پۆ)، هێشتا جەدەلی خیانەتە ناچارییەکەی وەرگێڕانی شیعر بەردەوامە (تاکە خیانەتی جوان). چونکە وەرگێڕانی شیعر تەنیا ئەرکێکی تەکنیکی نییە بە گواستنەوەی وشەکان و ناوەڕۆك و شێواز بۆ زمانێکی دیکە کۆتایی بێت، شیعر بە تەنیا پێکهاتەیەکی زمانەوانی و مانابەخشین نییە، بەڵکو تیایدا دەنگ و ڕەزم و سرووتەکانی هەناوی زمان بە هاوتەریببوونێکی داهێنەرانە (بە یەکەوە و لە یەککاتدا هەنگاو دەنێن)، ئەم هاوتەریببوونەیش مەحاڵە لە کوچە و شەقامەکانی زمانێکیتردا بتوانێت ڕێ بکا، مەحاڵە لەبەر ئەوەی زمانەکان تونێلی سایکۆلۆژی و قالبی مۆسیقا و نەسەقی بوونی تایبەت بە خۆیان هەیە.

بە هۆی ئەم وەرگێڕانە (پێویست و مەحاڵە)ی "بەڕۆژ ئاکرەیی" هاوڕێم بۆ شیعرەکانی ئەحمەدی شاملوو، خوێنەر جیاوازی و تایبەتمەندێتی و سیمای بەرداری فرەیی لە نێوان ئینسان و جوانیدا، ئینسان و هونەردا دەدۆزێتەوە. ئەرێ ئەمە قەدەرێکی سەیر نییە؟ لە هاوکێشەی وەرگێڕانی شیعردا هەمووان تیایدا براوەن: نووسەر و زمان و خوێنەر، تاکە دۆڕاو تیایدا وەرگێڕە! وەرگێڕ ئەو دێوەرە ڕەزاگرانەیە کە خوێنەر بە گومانەوە تەماشای دەکا و کەچی ناچاریشە و ناشتوانێت متمانە بە گەڕان و ئەزموونەکەی نەکات، لە جاحزەوە تا دەگاتە ڕۆمان

یاکۆبسن بە شێوەیەك لە شێوەکان وەرگێڕی شیعر لە میوانێکی ناوەخت دەچێت و تەنیا لە ڕێی ئەویشەوە خانەخوێ دەناسین.

گەر ئەم چیرۆکە سواوەی غەدر و مەزڵوومیەتی سەرەوە پێچەوانە بکەینەوە، ئینجا نرخی شاعیر و ڕووناکبیرێکی وەکو بەرۆژ ئاکرەییمان بۆ دەردەکەوێ، کەمێك ئارامیشم لەوەی ئەم غەدرە بەرانبەر بەرۆژی هاوڕێم تازە نییە و ئەکید ئێستا ڕاهاتووە، چونکە ئەو: سێ دەیە زیاترە لەناو ناوەندی ئەدەبیاتە و چەندین کتێبی ناوازەی شیعریشی بڵاوکردۆتەوە و ئاوڕی شایستەی لێ نەدراوەتەوە، لە مێژووی دوای ڕاپەڕینەوە و ئێستایشی لەگەڵدابێت ناوەندی شارەکان (هەولێر و سلێمانی) زۆر زاڵمن بەرانبەر ئەو بەهرانەی لە ئەترافەکانەوە دێن، ئەمە نەك ئەوانەی لە پشدەر و قەراجەوە، لە سۆران و خۆشناوەتییەوە، بگرە تەنانەت شارێکی پڕ لە مێژووی داهێنانی وەکو کەرکووکیش بە شێوەیەك لە شێوەکان ئەو باجە دەدەن، ئەمە چ جای بۆ بەرۆژێك کە بە ڕۆژی ڕووناك دەیسەلمێنێ خۆی هەولێرییە و نازناوی ئاکرەییە و لە ئێران ژیاوە و لە سویدیش هاتۆتەوە؟ من کە فارسی نازانم، مافی ئەوەم نییە متمانە بە وەرگێڕانەکەی شاملوو ببەخشم، بەس بۆ شیعر، زیاتر متمانەم بە وەرگێڕانی شاعیر هەیە، وەرگێڕانی ئەو سیحرەی لە شیعرییەتەوە دێت و ئاوێزانی مۆسیقای وشەکان بووە زیاتر لە شاعیر دەوەشێتەوە، ئەمە وەکو ئەوە دەچێت لە دەفرێکەوە بۆ دەفرێکیتر بە بێژینگ ئاو بگوازیتەوە، (خۆ هەر دەڕژێ، دەڕژێ) بەڵام شاعیر باشتر دەتوانێت دەفرەکان لە پڕبووندا یەکسان بکاتەوە.

زۆر لەوانەی لە وەرگێڕانی شیعر دواون پێیان وایە جیاوازیی نێوان تێکستی ئەسڵی شیعر و وەرگێڕدراوەکەی لەوە دەچێت کە گوڵێك لە باخچەدا بگوازیتەوە ناو ئینجانەیەك، کەمترین برینداركردنی ڕیشاڵی ڕەگەکەی دەبێتە مایەی سیسبوونی. بۆیە ئەوەی دەیگوازیتەوە باشترە باخەوان بێت. خۆ دەشکرێت وەکو عەزرا پاوەند و یاکۆبسن و ئەدۆنیس پێمان وابێت شیعری وەرگێڕدراو پێویستە دووبارە خەڵقکردنەوەی بێت و وەرگێڕ بە سەلیقەی خۆی دووبارە بەرهەمی بێنێتەوە (دەکرێ ناو بنرێ نووسینی ناڕاستەوخۆ) ئەم شێوازە بە قسەی توێژەران زۆر سەرکەوتوو بووە (بۆ نموونە لە ئەزموونی وەرگێڕانی ئەدۆنیس بۆ شیعری سان ژۆن پێرس و ئەزموونی عەزرا پاوەند لە وەرگێڕانی شیعری چینی)، بەڵام لە دوو ڕۆشەنبیری گەورەی عەرەبی و ئینگلیزیدا، سەدان وتار و چەندین کتێب دژی ئەدۆنیس و عەزرا پاوەند هاتنە دەنگ، کەواتە دەبێ بۆ وەرگێڕێکی کوردی قەلەندەر چەند کەس خۆیان لێ ببێتە حەسەن قزلجی و عەبدولڕەحمان زەبیحی؟ چەند کەس بۆ بەڕۆژ ئاکرەیی و هاوەڵە وەرگێڕەکانی خۆیان لێ ببێتە عەبدولخالق مەعروف و بنووسن (شاملوو و کێ ڕاستە؟).

دەشبێ ئەوە بڵێین خوێنەریش مافی خۆیەتی لەناو وەرگێڕانەکاندا تووشی مەتاهە و ونبوون بێت بە شوێن نزیکترین وەرگێڕان لە تێکستە ئەسڵییەکەوە، خۆ دەقی وەرگێڕدراویش زۆربەی کات هەمان ڕێسای دەقی داهێنەرانەی بەسەردا دەگونجێ لەوەی لە ڕووی باشی و وردی و ئەمانەتەوە: زەمەن

کەفیلە بە مانەوە و زیندووهێشتنەوەی. لێرەدا زۆر لایەنگیری بۆچوونەکەی "ڕۆلان بارت"م لەوەی (ئەو دەقە وەرگێڕدراوە بە درەوشاوەیی دەمێنێتەوە، کە زمان بە توخم و مادده نابینێ، بەڵکو زمان دەبێتە ئاسۆ، دەبێتە ئەتمۆسفێر).

دڵنیام لەوەی بەڕۆژ ئاکرەیی لە شێوەی زۆربەی هەرە زۆری وەرگێڕەکانی شیعر، دنیایەك وزەی شیعری خۆی لە شاملوودا خەرج کردووە، چونکە ئەوەی لەم کتێبەیدا هەیە ئەحمەد شاملوو نییە کە بە فارسی دەنووسێت، بەڵکو ڕۆحی ئەحمەد شاملووە لە جەستەی بەڕۆژ و جەستەی ئەلفوبێی کوردیدا، دەست خۆش بۆ ئەو خیانەتهی بەڕۆژ ئاکرەیی کە (لە نێوان ناشیرینێکی وەفادار و جوانێکی خیانەتکاردا) دووەمی هەڵبژارد.

دەشزانم چەندی ئەو شاعیرەی لەناو زمانی دایکدا مەزن و داهێنەر بێت، هێندە وەرگێڕانی ئەستەمترە، چونکە خوێنەرێکی زۆر بە موڵکی خۆی دەزانێت و لەوانەیە پێشی ناخۆش بێت لە خۆشەویستەکەی نزیك ببیتەوە، غیرە دەکات و بە بچووکترین بەلاڕێبردنی دێڕێك یان دەستەواژەیەك تووڕە دەبێت، وەك چۆن شاعیری سادەنووس و دژوارنووس هەیە، ئاوایش وەرگێڕ هەیە، من لە وەرگێڕە کوردەکانم بیستووە کە وەرگێڕانی شاملوو ئەستەمترە لە وەرگێڕانی شاعیرانی تر، ئەمە لەو زمانەیش هەیە کە من کەمێکی دەزانم، لە عەرەبیدا وەرگێڕانی مەحموود دەروێش بۆ نموونە ئەستەمترە لە وەرگێڕانی محەمەد ماغووت یان ئونسی ئەلحاج یان بلند حەیدەری، شاملوو دەنگێکی دەگمەنە لەوانەی هاوار دەکات و وەکو گۆرانییش دەمێنێتەوە،

هاوار دەکات بەبێ ئەوەی لێ بگەڕێ ببێتە لافیتە و دروشم، لە پشت ئەو هەموو ئیلتیزامەی بەرانبەر ژیان و ئینسان هەیەتی، بەشی بێهودەیی دەهێڵێتەوە، بەشی تەنیایی و نەهامەتی، ئەو دەزانێت لە کۆتاییدا ئینسان سیزیفە و بەردەکان بەرەو بێ جەدوایی لە کۆڵ دەکات و دەشبێت لەژێر قورسایی ئەو بارەدا لە گۆرانیگوتن نەکەوێت. شاملوو دەزانێت دەبێ (بەردی پەیڤەکان، بەردی قافییەکان) بەرەو هەورازی مانا، بەرەو بیابانی بێمانایی ببات و خانووێك دروست بکا (کە پێی دەگوترێ: زیندانی زمان)، ئەوەی شاملوو لە تەك نالی و ئالیۆت و گۆران و ئۆکتافیۆ پازدا، تیایدا هەستی بە بەندی دەکرد.



له بانێژەی مەرگەوە

بـــۆنـــی هـــەڵاڵان دێ

## (هەڵوەستەیەك بۆ مامۆستا مەحموود زامدار)

لە هاوینی ساڵی ١٩٨٦ـدا، کە ئەوسا تەمەنم ١٥ ساڵ بوو، شیعرێکی خۆم لە گیرفان نا و چووم بۆ لای مامۆستا مەحموود زامدار کە ئەوسا لە نووسینگەی ڕۆژنامەی هاوکاری کاری دەکرد، نووسینگەکە کەوتبووە بەرانبەر کتێبخانەی گشتیی هەولێر، شیعرەکە لە گیرفانمدا (عەبدوللا پەشێو) گوتەنی: دڵی دووەمم بوو لێی دەدا. پێش ئەوەی بچمە لای مامۆستا زامدار و بوێرم شیعرەکەی پێ نیشاندەم، کەمێك لە باخچەکەی کتێبخانەی گشتیی هەولێر پیاسەم کرد و یەك دوو جار بە جددی ویستم بگەڕێمەوە ماڵەوە، ئەوەی هاندەرم بوو هەنگاو بنێم و بتوانم دڵی دووەمم نیشانی مامۆستا زامدار بدەم، تەنیا ئەوە بوو کە دەمزانی و بیستبووم زۆر ڕێز لە خولیا و بەهرەی گەنجان دەگرێت. بەهەرحاڵ چووم و فەرمووی لێ کردم، منیش بە نوتق گیراوی ورتەورتێکم کرد و شیعرەکەم بە دەستێکی لەرزۆك خستە سەر مێزەکەی، خوێندیەوە و بە قەڵەمێکی سوور هەندێ وشەی گۆڕی و گوتی باشە تۆ بۆ دەتەوەێ شیعر بنووسیت؟ منیش گوتم بۆ ئەوەی بەشداری بکەم، یەکسەر گوتی گەر بۆ بەشداری شیعر دەنووسیت، مەینووسە! گوتم بۆچی؟! گوتی لەبەر ئەوەی شیعر بەشداری نییە و هەڵتەکاندنە، ڕووخاندنە، تەجاوزکردنی کەسانی پێش خۆتە، بەڵام دیار بوو شیعرەکەی بە دڵ بوو بە بەراورد لەگەڵ تەمەنم،

دوای ماوەیەك شیعرەکەم لە ڕۆژنامەی هاوکاری بڵاوکرایەوە و تا بەیانی لە خۆشیاندا خەوم لێ نەکەوت.

من بە گشتی یادەوەریم بۆ لایەنە وردەکانی ڕووداو، باش نییە، بەڵام ئەو سەردانەم قەت بیرناچێتەوە، لەبەر ئەوەی بڵاوکردنەوەی یەکەم شیعر، وەك ماچ و خۆشەویستی یەکەم وایە و بە ئەستەم بیر دەچێتەوە، لە لایەکی تریش یەکەم جار بوو کەسێك ببینم بەم شێوەیە و بە جوانی لەبارەی شیعر و تازەگەرییەوە قسە بکات.

کەم نووسەر و هونەرمەندی هەولێر هەیە، یەکەم نووسینی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا لەسەر دەستی زامدار بڵاو نەکرابێتەوە، یان چاککردن و شەنوکەوکردنی بابەتێکی بە ژێر قەڵەمە سوورەکەی گوزەری نەکردبێ، جار بووە لە ناوهێنانی ئەوانەی یارمەتی داون مامۆستا زامدار هێندەی دەژمارد، کە خۆیشی تاقەتی لە ژمارەکان دەچوو، زامدار پێش هەموو شتێك چاکەیەکی ئێجگار گەورە و بەرچاوی بەسەر شاعیرانەوە هەیە، ئەو توانی لە ساڵی حەفتای سەدەی ڕابردوودا شاکارەکەی شاعیری بەناوبانگ تۆماس سێرنز ئێلیۆت (وێرانە خاك) وەرگێڕێت و خوێندەوارانی کوردی پێ ئاشنا بکات، تەسەور ناکرێت چەند ئەستەم بوو لە ساڵی حەفتا کە گەرمەی شیعری چینایەتی و نەتەوەیی و چەپگەری و ئەدەبی مولتەزیم و شیعر و شانۆی شۆڕشگێڕی بوو، کەسێك هەبێت و لە شێوەی زامدار ئاوڕ لە وێرانەخاکی ئالیۆت بداتەوە، ئەمە وەك ئەوە وایە لە ساڵانی چلەکانی سەدەی ڕابردوو بە قانعی شاعیر بڵێیت: بەڕێز

پێویستە شیعری ئۆتۆماتیکی بنووسیت! کەچی زامدار لە خولیای نوێگەری و تازەخوازی خۆی نەدەکەوت.

جوانترین شت بە ڕای من لە زامدار ئەوە بوو کە نەدەچووە ناو ماڵێکی ئاراستەیەکی ئەدەبی و دانیشێت، هیچ ڕێباز و قوتابخانەیەکی ئەدەبی نەیدەتوانی ڕام و دەستەمۆی بکات و لە جووڵە و گەڕان و شەیدایی کەم کاتەوە، هەمیشە بە ڕێژەیی تەماشای داهێنانی دەکرد و بەردەوام داوای تەجاوز و بەزاندنی لە شاعیران دەکرد، دەیزانی شاعیر دەبێت مەلعوون و ناتەبا بێت لەگەڵ باو و ناسراودا، هەموو تامەکانی ژیانیشی تاقیکردبۆوە، ماوەیەك فەقێ بووە، ماوەیەك مارکسی بووە، ماوەیەك ڕۆمانتیکی بووە، ماوەیەك وجوودی بووە، ئەو لە هەموو فەلسەفەکانی دەخواردەوە و هیچ فەلسەفەیەکیش بۆی نەبوو بڵێت: زامدار لە شوێنی خۆتدا بمێنەوە، فەقێ بووە، بەڵام نەبۆتە مەلا. مارکسی بووە، بەڵام نەبۆتە کۆمۆنیست. ڕۆمانتیکی بووە، بەڵام نەبۆتە عاشق. وجودی بووە، بەڵام نەبۆتە دەروێشی سۆرین کیرکەگارد. بەیەکەوە بە قەد یەك: ئەڵا ئەڵای بۆ شیعرێکی نالی و شیعری گەنجێکی بەهرەدار دەکرد، بە یەکەوە و بە قەد یەك: دڵی بە مەحوی و هەرزەکارێکی خوێندەوار خۆش دەبوو.

یەکێك لە وێستگە گرنگەکانی شیعری هاوچەرخی کوردی، ئەزموونی شیعری هەشتاکانی هەولێرە، ئەم وێستگەیە لەسەر دەستی کۆمەڵێك بەهرەمەند هاتەکایەوە، کە دیارترینیان (عەباس عەبدوڵلا یوسف و جەلال بەرزنجی و دڵشاد عەبدوڵلا و کەریم دەستی و هاشم سەراج و نەوزاد ڕەفعەت و ئیسماعیل بەرزنجی،

هتـد..) بـوون، بە چاوپۆشـین لەوەی ئەو نەوەیە تـا چ ڕادەیەك توانیان پەرە بە دنیابینی و ڕوئیـای شـیعریی خۆیـان بـدەن، بەڵام هەمیشە وەك وێستگەیەكی پـڕ بەهـا لە مێـژووی شـیعری تـازەی کوردیدا تۆمار دەکـرێن. بـۆ ئەم نەوەیە مامۆسـتا زامـدار پشـکی شێری لە سەپۆرت و ڕێنوێنی بەر دەکەوێت، ڕاستە زامدار لەنـاو شیعر و لەبارەی شیعرییەتدا بەشداریەکی تیۆری ئەوتۆی نەبـووە، بەڵام لە دەرەوەی شـیعر و شـیعرییەتدا پاڵپشـتێکی گەورەی ئەو ئەزموونە بـوو، دەرگـا و دەروازەی ڕۆژنـامە و گۆڤارەکـانی بـۆ واڵا کردبوون، کۆڕ و سمیناری بێشوماری لە زۆربەی شارەکانی عێراقـدا بـۆ بەسـتوون، ئەڵقەیەکـی گرنـگ بـوو بـۆ بەسـتانەوەی ئەزموونی هەشـتاکانی هەولێـر بە قەڵەمە تازەخوازەکـانی عەرەب لە سەرتاپای عێراقدا، من پێم وایە ئەزموونی هەشـتاکانی هەولێـر گەر لە ڕووی شیعر و تێگەیشتن لە شیعردا سـوودیان لە زامـدار نەبینیبێــت، ئەوا لە ڕووی ڕاگەیانــدن و ســەپۆرتی ناوەنــدی ئەدەبیـاتی کـوردی و ڕێخۆشـکەریی بـۆ ناسـینیان، سـوودێکی ئێجگار گەورەی هەبووە.



## عەبدوڵڵا پەشێو

## قوربانیی مێژووی ئاوەژوو

## ڕووی زەمان ڕەش بێت، لە مەردان ڕووی کە وەرگێڕا ئیتر
## دێتە مەیدان بڵح و نامەرد تێك دەدەن ڕەسم و شیعار

**حەمدی**

مێژووی کورد لەناو کتێبی قوتابخانەکاندا و لە ڕۆژنامەی حزبەکاندا زۆر جیاوازە لەو مێژووەی هەموومان دەیزانین. لەناو کتێبەکاندا هەموومان پاڵەوانین، کورد لە مێژوویدا نە خیانەتی کردووە و نە شەڕی براکان و خاڵۆزاکانیشی هەبووە. لەو مێژووە شیرینەدا منداڵەکانمان لە خەونی پاکیزەییدا خەوتوون، تا هەراش دەبن و دەزانن مێژووی کورد حیکایەتێکی درێژ و بێمانای هاوسەرگیرییە لە نێوان پارە و سیاسەت، دەسەڵات و خیانەت.

ڕەنگە هەبن بڵێن مێژووی نەتەوەیەکی ژێردەستەی سەدان ساڵە ناکرێت هێڵێکی چەوتی لێ بدرێت و تا هێلکەش نەشکێندرێت، کێکی حوکمڕانی دەست ناکەوێت. منیش پێم وایە مێژووی کورد گەر ژوورێکی تاریکیش بێت، ئەوا دەلاقەی ڕووناکی تێدایە، بەڵام قەت ئەو دەلاقانە (تاك و تەرا نەبێت) لەسەر دەستی سیاسیەکان و دەسەڵاتداران دروست نەکراون، بەڵکو لەسەر دەستی شاعیرەکان بووە، حیکمەت و کەرامەتی نالی زۆر گەورەترە لە دنیابینیی حاکمەکانی بابان کە هەموو کردەویان بریتی بووە لە زووتر ڕووتاندنەوەی خەڵك و پەیداکردنی ئەو سی هەزار تومەنەی دەیدەنە والیی کرماشان کە

له کاتی خیانەتی براکانیاندا دەیگێڕانەوە بۆ حوکم. تەقەتەقی چاپخانەکەی حاجی تۆفیقی پیرەمێرد کاریگەرتر بووە لەو شەوە زیکر و تەڕاویحانەی شێخ مەحموود بە کوردەکانی دەکرد. ئەوە ئەحمەدی خانییە یەکەم دۆکیۆمێنتی بیری نەتەوەیی تۆمار دەکات. ئەوە حاجی قادرە باسی گرنگیی صەحافە و سەقافە دەکات لەو کاتەی سەرۆك عەشیرەتەکان و ئەو مەلایانەی بازرگانییان بە خەڵکی خوا دەکرد، دیوەخانانەیان لە سوڵتانی ئەعزەمی عوسمانلی بۆ بڕابۆوە. ئەو فیلمە ڕەش و سپییە لە ئێستادا بە ڕەنگاورەنگی دووبارە دەبێتەوە. بەڵام چ ڕەنگێك، بە داخەوە فیلمەکە لە ڕەنگی پەڕۆی سەر بارەگاکان تێپەڕ ناکات، کە بە هۆیەوە مێژوویێك نووسراوەتەوە و تۆمارکراوە دوور و نزیك ناچێتەوە سەر ڕاستی، سوپای ئەدیبانی مەعاشخۆری حزبەکان سەرقاڵی گەورەکردنی ئەو ئەدیبانەن کە هەموو توانا و کارامەییان بریتییە لە شێواندنی ڕاستییەکان و بچووککردنەوە و پەراوێزخستنی ئەو ئەدیبانەش کە هەموو گوناهیان ئەوەیە پرسیار و گومان لە وەڵامە چەقبەستووەکانی ئەو مێژووە بکەن، کەوا بەسەر منداڵانی قوتابخانەکاندا ساغ کراوەتەوە. ئەرێ خوێنی ئەو هەموو قوربانییانەی شەڕی ناوخۆ لە کوێی ئەو مێژووەدایە؟ ئەو مێژووە باسی زیاتر لە ملیۆنێك کورد ناکات پەڕاگەندەی وڵاتان بوون و چەقە چەقی ددانیانەکانیان لە دەریای ئیجەدا، پێ باشتر بوو لە شایی و شایلۆغانی ئاهەنگی یادی حزبەکان، لە ڕاپەڕینەوە بڵاوکراوەکانی حزب یەك تەقەی ناهەقیی تۆمار نەکردووە، هەموو ئاژاوەکان، هەموو ناهەقییەکانیش لە ژێر

دروشمی کوردایەتییەوە ئەنجام دراون! تا ڕادەیەك پرسیاری کەسوکاری بێسەروشوێنەکانی شەڕی ناوخۆ بۆتە مایەی ئەوەی لێنەگەڕێن بەردەوام بن لە خەباتیان و کاتی بەنرخیان بۆ ئەو پرسە لاوەکییە تەرخان بکەن، هەزاران هەزار وتار نووسراون تەنیا بۆ ئەوەی خۆڵ بکرێتە چاوی ئەم میللەتە بەشمەینەتە، ملیۆنەها تیشك خستنەسەر و تەئکیدکردنەوە بڵاوکراوەتەوە، تەنیا بۆ ئەوەی وێنای دنیایەك بکرێت، واقیع بشارێتەوە. گەشتی بۆینباخکڕین و پێڵاوکڕینی مەسئولەکان بەو ئامرازە گۆبلزییانەی نهارا جهارا بە کاری دێنن، لە بڵاوکراوەکانی حزبەکاندا هێندە پیرۆزن، وەك ئەوەی ئیسرا و میعراج بووبێ. سەیرەکەش لەوەدایە ئەو مێژووەی ئەوان ئێستاش دەستگرتن بەسەر موقەدەراتەوە لە ژێر دروشمی نەتەوەیی و کوردایەتییەوە تۆمار دەکرێت! باشە ئەدی ئەگەر بە ئاشکرا باوەڕی خۆت سەبارەت بەو مێژووە دەربڕی چیت بەسەردێ؟ بێ قەید و شەرت چارەنووست وەك چارەنووسی عەبدوڵلا پەشێو لێ دێت، بە زیندوویی لەناو مێژوودا دەنێژرێیت، بایکۆتی نەك بەرهەم و فیکرت دەکرێ، بەڵکو کار دەپەڕێتەوە ئەوەی وەکو مردووێکیش ناوت نەهێنرێت، چەندین ساڵە پەشێو لەناو بڵاوکراوەی حزبەکاندا حسێبی مردووشی بۆ ناکرێت! چونکە شیعر و فیکری پەشێو وەك ئەوەی دراوێك بێت، لەو بازاڕە هیچی پێ نایەت. گرفتی ئەو شاعیرە ئەوەیە گەر دراویش بێت، دراوێکی یەکڕووە، دووڕوو نییە .

من پەشێوم نەناسیوە، ناشمەوێت بیناسم. نەمدیوە، ناشمەوێت

ببينم، ڕەنگە لەگەڵ نرخی ئیبداعیی شیعرە سیاسییەکانیشی ناکۆك بم و لە ڕووی شیعرییەتی شیعرەکانییەوە چەندین تێبینیم هەبێت، هەندێکیشیان لە دیدی خۆمەوە بە شیعر نازانم، ئەگەر ئەم چەند دێڕەش نەنووسم گلەییم لێ ناکرێت، گلەیی لە ئەدیبانی هاوتەمەنی ئەو و نەوەی ئەو دەکرێت کە هیچیان تاوەکو ئێستا نقەیان نەهاتووە، لە بەرانبەر ئەو پەراوێزخستنەی پەشێودا مێشیان میوان نییە! خۆ لەوانەشە هەندێکیان بە ئاژاوەگێڕ و تێکدەری کاروانی کوردایەتی بزانن و بە هەڕەشەیەکی جددی لە قەڵەم بدەن بۆ سەر ئەزموونی حکوومەتی هەرێم و ئامادەش بن تیشك بخەنە سەر ئەو نەهامەتییانەی شیعرەکانی پەشێو بەسەر بارودۆخی کوردستاندا هێناویەتی! شاعیری هاونەوەی پەشێو هەیە، ئامادەیە شیعر لەسەر فتق و مایەسیری مەسوولەکان بنووسێت، کەچی ئامادە نییە ستوونێك بۆ پەشێو پڕکاتەوە! هەموو گوناهی پەشێو ئەوەیە، نموونەیەکی جوانی ئەو مرۆڤانەیە کە بە هەڵچوونێکی شاعیرانە گومان لە ڕاستیی مێژووییان دەکات. بە تووڕەبوونێك کە زۆر لە تووڕەیی منداڵێك دەچێت کاتێ باوکی غەدر لە دایکی دەکا : هاوار بۆ نەهێشتنی ناهەقی دەکات. پەشێو لە ڕاستگۆیی هەولێرییەکان دەچێ، لە دووریی بیست مەترەوە لە ڕوخساریدایە خۆشی پێت دێ یان نا؟ ماسك نابەستێت و بە لۆچەکانی خۆی ڕازییە. ئامادە نەبووە قژی بۆیاخێکی ڕەشی باینجانی بکات و ببێتە خەبیری مکیاژ لە یەکێك لە دەزگاکانی حزبدا. نەیتوانی بە شیعر درۆ بکات و لە دڵیشدا تۆبە بکا، نەیویست خۆی نەبێت. نەچووە سەر ئامێری

کۆپی و دیزاین تا بە مقەست لێوارە زیادەکانی ببڕن. ڕووتیی سەر کاغەزی پێ باشتر بوو لە بۆینباخی زەرد و سەوز و چاکەتی گیرفان گەورە. بەستەڵەکی ئۆرۆپای پێ گەرمتر بوو، لە هەڵمی نانێکی دزراو. برسێتی هەڵبژارد و نەبووە هەریسەخۆری کوشتنی حوسێنەکان.

پەشێو فرمێسکی زۆری ڕشت و دەسەڵات سەتڵ سەتڵ کردییە ناو موبەڕیدەکانی ئیعلامە مەرکەزییەکانەوە، پەشێو هاواری زۆری کرد و دەسەڵات قیژە قیژە خستییە ناو مۆنتاربۆی سەربانی بارەگاکانی لا کۆڵانەوە. پەشێوێك کە بەر لە دروستبوونی زۆربەی حزبەکانی کوردستان شاعیر بووە، بە ڕوانگەیەکی کرمییانە دەیانەوێ ناو و بەرهەمی پەشێو وەلابنێن!

من قەت کەسێکی نەتەوەیی نەبوومە، باوەڕیشم وایە نەتەوە تەنیا بازنەیەکی گەورەترە لە هۆز و عەشیرەت، بەڵام گەر بێینە سەر نیشتمانپەروەری: کێ هێندەی پەشێو کورد بووە؟ لە پەنجاساڵی ڕابردوودا کەسێکم پێ بڵێن هێندەی ئەو بە جوانی و مەردایەتی کوردانی هەڵدابێت. گەردێکی ئەخلاقی و ماددی و مەعنەوی ئەو پیاوە بخەنە ڕوو؟ یەك بە هەزار قبووڵمانە، تێبینییەك لەسەر پەشێو بدۆزنەوە و میللەت لە هەزار گوناحی حزبەکان خۆش دەبێ. تاکە شت لە هەموو ژیاندا مارف خەزنەدار و عیزەدین مستەفا ڕەسووڵی کۆکردبێتەوە تەنیا شاعیربوونی پەشێو بووە، کە هەردووکیان پێشەکیان بۆ دیوانەکانی نووسیوە! لە تاریکترین دەیەی شیعری کوردی کە بریتییە لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو، پەشێو تاکە چرا

و تەنیا درەوشانەوە بووە. پیاوێك ئەو هەموو فرمێسکەی بۆ کوردستان ڕژاندبێت، مافی تانکەرێکی نەوتی قاچاغیشی نییە بە مانشێتێك لە ڕۆژنامەکانی حزبدا ناوی بێت؟! لە نیوەشەواندا مانکێتی لاپەڕەیك هەڵدەوەشێنرێتەوە لەبەر ئەوەی بۆینباخی کونسوولی تورکی باش دەرنەچووە، یان مەسوولێك لە گەشتی سەعات سێ و نیوی دوای نیوەی شەو بە فڕۆکەیەکی هێڵی تورکیش ئێرلاین تەشریفی موبارەکی هێنایەوە خاکی هەرێم و پێویستە بکرێتە هەواڵی تەشریفات.. کەچی پەشێوێك ئەو کاتەی بڕیاریشی دا کەسێکی خۆش بوێ هەر دەبوایە ناوی (کوردستان) بێت، کەچی لە لاپەڕەی نەعییشدا لە تەندروستی پرسیار ناکرێت. بێئومێدم لەوەی سوپای ئەدیبانی بێ ئەدەبیان تەسریح بکرێن و بیاننێرن بۆ سەرژمێریی ژمارەی قوربانیانی شەڕی ناوخۆ! بێئومێدم لەوەی زەعیمە موفەداکان، گرێبەستێك لەگەڵ ڕاستیدا ببەستن و پارە تەلاق بدەن!

به ڕاست.. بیرم نەبوو ئەوە بڵێم کە ڕەنگە پەشێو پێش هەمووان لە من تووڕە بێت، لەوەی پێم ناخۆشە بایکۆت بکرێت و گلەیی ئەوەش لە من بکات کە بە چ ڕوویێك داوا دەکەم بخرێتە مێژوویێکەوە، کە ئەو بە زبڵدانیشی نازانێت!

لەتەك پەشێودا.. من بێبەریم لەو مێژووەی ئەوان و تا ماویشم خەون بە چوونە ناوییەوە نابینم:

اللهم قد بلغت.. اللهم فاشهد..



نانۆ تاتۆ دەکەم

نـانۆ تـاتۆ دەکەم، کتێبێکـی شیعریی مامۆسـتا عەبـاس عەبـدوڵڵا یوسفە کە بریتییە لە (٨٦٠) هۆنراوەی تاکدێڕی.

گرنگیی ئەزموونی شیعری مامۆستا عەبـاس لە کەس شـاراوە نییە، خوێنەرەکانی ئاستی ناوەندییان نییە، یان بە توندی بەرگریی لێ دەکەن، یان بە توندی ڕەتی دەکەنەوە. بەڵام ئەو جیاوازییەی من شایەتی بۆ بـدەم، ئەوەیە کە لەکاتێکـدا زۆربەی شـاعیران لە ڕێـی زمـانەوە دەچـنەوە نـاو یـاری ڕازیکردنـی خـوێنەر و کۆمەڵگـاوە، ئەوە ع.ع.یوسـف لە ڕێـی زمـانەوە لە خـوێنەری تەقلیـدی و کۆمەڵگـا ڕادەکـات. لە ڕووی شـیعرییەوە دەگمەنـن ئەوانەی وەکو عەباس عەبدوڵڵا دوور لە سیاسەت و پێداویستییە هەنووکییەکـــان، دوور لە میـــدیاکان و گەورەکـــردن و بچووککردنەوەی ڕووداوەکـان ڕۆشـەنبیرییە فـراوانەکەی بخـاتە گەڕ و هەر دوو پێی لەناو ئەدەب بێت.

هەمووما‌ن (بە شاعیرەکانیشەوە) سۆز و بەزەییمـان بـۆ ئینسـانە هەژار و نەدار و پەراوێزخراوەکـان هەیە، ئەمە لە ژیانـدا. بەس وێڕای ئەمە ئەو لە ئەزموونی شیعریی خۆیدا سـۆز و بەزەیـی بـۆ پیـت و وشـە هەژار و نەدارەکـان هەیە. بە ڕای مـن گرنگیـی فەرهەنگیی ئەو کتێبە شـیعرییە لە خاڵێکـدایە: ئەویـش نەهێشتنی عاتیفە و سۆزە وەك کۆڵەگەیەك لە کۆڵگەکانی شیعر. دەمێکە لە شـیعری ڕۆژئاواییـدا بـاس لەوە دەکرێـت کە دەشـێت سـۆز کۆڵگەیەك نەبێت لە کۆڵەگەکانی شـیعر، نەك بەو مانـایەی شـیعر خاڵی بێت لە هەسـت، بەڵکـو خـاڵی بکـرێتەوە لەو هەسـتەی کە هەنـدێك وشـە (نرخـی ئیسـتاتیکی پێشـوەختەیان هەیە): گـوڵ و

پەپوولە و تریفە و هتد.. ئەمانە بکرێنەوە بە وشەگەلێك کە هیچیان زیاتر نەبێت لەو وشانەی بەپێی بەکاربردنییان (نرخی ناشیرینیی پێشوەختەیان هەیە) وەکو: سیسرکە و جیق و ڕیقنە و هتد..

لە ڕاستیدا زۆربەی شاعیرانی ئێمەش موغامەرە و سەرکێشی بە خوێنەرەکانییان ناکەن، ئەو دارشتن و وێنانە بەکار دێنن کە میزاجی گشتی داوای دەکا، هەر لێرەشەوە دەبینین هەندێك لە شاعیرانی ئێمە وەك سۆفی خۆیان نمایش دەکەن (بەڵام سۆفییەك کە دوایین مۆدێلی ئۆتۆمبێلی لایە).

ئەوەی ئەم کتێبەی مامۆستا عەباس بخوێنێتەوە، دەزانێت شاعیر تا چ ئاستێك نەیاری ئەو پەیوەندییە باو و سونەتیانەیە کە ئەمڕۆ لە دارشتنی شیعر بەکار دەبرێن، تا ئەو ڕادەیەی لە هەندێ شوێندا هەست دەکەیت خولیای بۆ تێکشکاندنی زمان و خلیسکاندنی مانا گەیشتۆتە ئەوەی شیعرییەت بەرهەم نەهێنێ.

لە ڕاستیدا مامۆستا عەباس لە من باشتر ئەوە دەزانێت کە لە شیعردا تەنیا دۆزینەوەی پەیوەندیی نوێ و بەکارهێنانی وشەی پەراوێزخراو بەس نییە بۆ ئەوەی شیعر بنووسرێت، بەڵکو مەرجی هەرە گرنگ لەو بەکاربردنەدا بەرهەمهێنانی شیعرییەتە.

هەرچەندە دەشزانم کە بەکارهێنانی هەندێ وشەی وەکو (سکراب، سەروپێ، غۆرێلا، قالۆنچە، میکرۆب، گوو و سەدانی تر) ئەستەمە (بەڵام مەحاڵیش نییە بتوانرێت بخرێتە سیاقی ستاتیکییەوە). یەکێك لە شتە هەرە جوانەکانی ئەو کتێبە ئەوەیە هەست دەکەیت کە شیعری سالۆنەکان نییە کە تیایدا میوانەکان

له کۆڕێکدا مۆز و پرتەقاڵییان لەبەردەمدایە و گوێی بۆ دەگرن، شیعری ئەوانە نییە کە خۆیان بە پاڵەوان دەزان و پێیان وایە چەقی گەردوونن، بەڵکو شیعری ژیانە، شیعری ئەوانەیە کە بە تەنیشت نادییەکانەوە ڕەت دەبن و بۆنی کەباب دەکەن، دەکرێ لێرەدا بڵێین: کە ئەو کتێبە دەیەوێت هەمان ڕۆڵی دۆن کیخۆتەی سێرڤانتس ببینێت، لەوەی ئێمە هەموومان بەرامبەر مردن و هەژاری و نەخۆشی: شەڕ لەگەڵ هەوادا دەکەین.

بەرامبەر تەنیایی بێجگە لە ڕمێکی کول هیچی تر شك نابەین.

بە درێژایی مێژووی ئەدەبیاتی ئێمە، شاعیر دەبوایە مەبدەئی بێت، لە کاتێکدا پێویستە ئەوە بزانین کە گەورەیی ئەدەب لەوەدایە هی کەسە بێ مەبدەئەکانیشە.

شاعیر دەبوایە پاڵەوان و ئازا و شەڕاگێز بوایە، لە کاتێکدا گەورەیی و گرنگیی ئەدەب لەوەدایە کە هی کەسە شکستە و ترسنۆك و تەنیاکانیشە، ئەدەب هی تاوانبارەکانیشە، دەکرێ پیاوکوژێك لە ڕێگەی شیعرێکی جوانەوە پاك بێتەوە.

لەم کتێبەیدا، ع.ع.یوسف دەیەوێت ئەوەمان بیربخاتەوە کە شیعر تەنیا هی وشە جوان و پەمەیی و ناسکەکان نییە، دەنا سکراب چی کەمتر لە پەپوولە؟!

ئەوە ئێمەین بڕیاری پێشوەختەمان داوە بەرامبەر پاکی کەناری و پیسی قالۆنچە، دەنا ئاو هەر ئاوە لەناو بوتڵ کرابێت یان لە تاڤگەوە بڕژێت. لێسەندنەوەی زمان لە بەکاربردنی گشتیدا هەوڵێکە جێگەی دەستخۆشییە، دەنا عەباسیش ئەوەندە

ڕۆشەنبیریی شیعری هەیە وەکو ئەوانیتر سەرقاڵی دارشتنی باو و ناسراو و زانراو بێت، وەکو یەکێك لە یەکەکان حسێبی بۆ بکرێ و بە عەتری کۆکۆ شانیلەوە کۆڕی شیعریی سێ سەعاتی بگێڕێت..





**قوبادی جەلیزادە**

**هێنانەوەی جەستە لە مەنفا**

ویڕای ئەوەی شیعرەکانی قوباد زیاتر لە بابەتێك لەخۆ دەگرن، بەڵام چەقی شیعرەکانی دوو ئاراستەی سەرەکییان هەیە، یەکەم بابەت (کە جەستەیە)، دووەمیش (ئیرۆتیك)، کە سەراپاگیرە و بێجگە لە ڕوئیا و دنیابینی، تەکنیك و زمانی شیعریش دەیانگرێتەوە، بۆیە ناچارم لەم دەرفەتە کورتەدا ئەم بەسەرکردنەوەیە بکەمە دوو تەوەر، تەوەرێکیان تایبەت بێت بە جەستە کە بابەتی سەرەکیی شیعرەکانی قوبادە، ئەوەی دیکەیان لە ئیرۆتیك بدوێین و کە زیاتر گرنگیی بە دنیابینی شیعریی و چۆنییەتی مامەڵەکردنی قوباد دەدات لەگەڵ تەکنیك و زمانی شیعری.

لە ڕۆژهەڵاتدا جەستە قسە و لێکدانەوەی زۆر هەڵدەگرێت، کۆمەڵێك لە بیرمەندان بۆ نموونە (محەمەد عابد جابری) لەوەش زیاتر ڕۆ دەچن و پێیان وایە کە سەرجەم مێژووی ڕۆژهەڵات لەسەر داپڵۆسینی جەستە بونیاد نراوە، تێڕوانینمان تەواو بەستراوەتەوە بە فیکری ئایینی. ئێمەی ڕۆژهەڵاتی تێڕوانینمان بەستراوەتەوە بە بۆچوونی ئایین سەبارەت بە سەرەتا و ئێستا و ئایندەی مێژووەوە. لێرەدا بە کورتی هەوڵ دەدەین باس لە پەیوەندیی نێوان جەستە و تێڕوانینی ئایین بۆ مێژوو بکەین.

سەرەتای مێژوو: لە تێڕوانینی ئاییندا بۆ سەرەتای مێژوو دوو هێڵی سەرەکی هەیە: یەکەم/ ڕۆح، کە ئەزەلییە، ڕەحمانییە، بێ کۆتاییە، لە نووری یەزدان وەرگیراوە و گوناە ناکا و قابیلی هەڵە نییە.

دووەم/ جەستە، کە فانییە، دنیاییە، شەیتانییە و لە نوور نییە و لە خۆڵ خوڵقێندراوە، گوناهکارە، سەرچاوەی هەڵەکانە.

ساتەوەختی دروستبوونی مێژوو لە تێڕوانینی هەر سێ ئاییندا (عیبری، مەسیحی، ئیسلامی) کە بە ساتی خواردنی سێو لەلایەن ئادەمەوە دەست پێ دەکات. خوداوەند لە یەکەم ساتی ناسیندا مەرج لەسەر لغاوکردنی جەستە دادەنێت، چونکە لای ئەو لە فیکری ئایینیدا (ڕۆح لە هێڵی ڕەحمانییە) قابیلی گوناه نییە، واتا ئادەم و حەوا گوناهی یەکەمیان بە جەستە ئەنجام دا. لێرەوە هەر لە سەرەتای مێژووەوە گەشتی پڕ لە ئازاری دەرچوون و دەرکردن لە بەهەشت (کە دەکاتە ئەبەدییەت) دەستی پێ کرد. گوناهی یەکەم جەستە کردی، بۆیە جەستە سزا دەدرێت و لە بەهەشت دەکرێتە دەرەوە. لەولاشەوە ڕۆح هەر بە پاکی دەمێنێتەوە، هەر سەبارەت بە سەرەتای مێژووش، یەزدان مەرجی کڕنۆشبردن (کە بێگومان بە جەستە ئەنجام دەدرێت) لەسەر ئیبلیس دەسەپێنێت، کەواتە دەرکردنی شەیانیش لە بەهەشت بۆ ئەنجامنەدانی مەرجێکی سەپێنراوی سەر جەستە دەگەڕێتەوە. دواتر کە ئایین دەست بە تیۆریزەکردن دەکات، هەڵەی هاتنە ناو ئازاری دنیا دەگەڕێنێتەوە بۆ ئادەم، کە نەیتوانی جەستەی خۆی بخاتە ژێر کۆنترۆڵەوە و تەسلیمی وەسوەسەکانی حەوا بوو. بۆیە ئایین لە پەیڕەودا ئەمر دەکات بەوەی حەوا تەواوی جەستەی خۆی داپۆشێت، تاوەکو ئادەمەکان دیسانەوە تووشی گوناه و هەڵە نەبنەوە (ئەو هەڵەیەی بە بۆچوونی ئایین مرۆڤ نرخی لەدەستدانی بەهەشتی بۆ بەخشی) بە بۆچوونی ئایین

مرۆڤ هەرچەندی لە جەستە دوور بکەویتەوە، لە پاکی نزیك دەبێتەوە، پێچەوانەکەیشی ڕاستە.

لە فیکری ئایینیدا، پیاوەکان پێویستە هەمیشە بە ئاگا بن، چونکە ژنەکان، حەواکان، هەمیشە چەکی فریودانیان لایە، فیکری ئایینی پێی وایە ئەگەر لە بەهەشت حەوا سێوێکی دەرخواردی ئادەم دابێت، ئەوا لە دنیاش دوو سێوی دزراوی بەهەشتی لە باخەڵدایە، هەردەم دەتوانن وەکو چەکی فریودان، هەڵەکردن، هەڵخەڵەتاندن بەری بهێنن. بێگومان لەم هاوکێشەیەدا زەرەرمەندی سەرەکی ژنەکانن، حەواکانن. چونکە بە سەرچاوەی فریودان لە قەڵەم دراون.

ئێستای مێژوو: بۆچوونی ئایین سەبارەت بە ئێستای مێژوو لەسەر هەمان دوو هێڵی (جەستەی شەیتانی و ڕۆحی ڕەحمانی) گیرساوەتەوە. لە ئێستای مێژوودا دەبینین، ڕۆح/ کە هێڵی نووری یەزدانە، هیچ ئەرك و مەرجێکی بەسەردا نەسەپاوە، بە پێچەوانەوە بۆتە قوربانیی جەستە و بە هۆی هەڵەی جەستەوە بەبی تاوان ناچاربوو لەگەڵ جەستەدا بەربێتەوە سەر زەوی، کە ئەمەش لە فیکری ئایینیدا سەلماندنی بەخشندەیی یەزدانە بۆ ئەوەی جەستەی گوناهکار و تاوانکار بە تەنیا نەیەتە دنیاوە، یەزدان ڕۆحی وەك هێڵێکی خێرخواز لەگەڵ جەستەی لادەر و شەڕانگێز ناردە سەر ئەم هەسارەیە، ئەمەش بۆ ئەوەی نەگوترێت یەزدان خاوەن بەزەیی نییە، ئەوەتا بەشێك لە نووری خۆی لەگەڵ جەستەی فەرمانشکێن ناردە دنیاوە، لە ئێستادا سەرجەم فەرزەکانی ئایین جەستە ئەنجامی دەدات (شەهادەهێنان و نوێژ و

زەکات و حەجکردن و بەڕۆژووبوون) جەستە ئەنجامی دەدات، ئەوەی لە ئێستای مێژوودا سەر بە هێڵی داپڵۆسینی جەستەی ژنەکانە، پاکن و ئەوانەیش دەیانەوێت دیالۆگ لەگەڵ جەستەدا ئەنجام بدەن لە فیکری ئایینیدا لادەر و تێکدەرن. بەو مانایەی لە فیکری ئایینیدا خەفەکردنی جەستە کۆمەڵ دەکاتە بەهەشتێکی بچووکی هاوشێوەی بەهەشتی لەدەستچوو. لە فیکری ئایینیدا دنیا بۆ ئەوە دروست کراوە کە مرۆڤ هەڵی پاککردنەوەی جەستەی هەبێت، ئەوەی نەفرەت لە دەرخستن و پیاهەڵدانی جەستە نەکات شایەنی ڕووبەڕووبوونەوەی کوشتنە. ئەمەش لە کورتترین پێناسەدا بنبڕکردنی هەموو ئازادییەکانی جەستەیە، لێرەوەیە هەمیشە تیرۆرکردنی ژنان شەرعییەتی ئایینی وەردەگرێت و پاساو بە تاوان دەدرێت.

ئایندەی مێژوو: فیکری ئایینی کە لە کۆتایی مێژوودا دەگاتە قیامەت ئەوە هەر بەڵێن بە جەستە دەدرێت، لەوێشدا هەر جەستە ئازار دەدرێت یان پاداشت دەکرێت، هەنگوین و هەنجیر و زەیتوون و حۆری و غیلمان هەر بۆ جەستەیە- لەولاتریشەوە ئاگری دۆزەخ هەر بۆ جەستەیە، واتا سزا و پاداشتی ئایندەی مێژووش هەر بە تەنها بۆ جەستەیە.

لێرەوە گرنگی و تایبەتمەندیی شیعرەکانی قوبادی جەلیزادە ڕوون دەبێتەوە، کە دەیەوێت ڕێز بۆ جەستەی ژنەکان بگێڕێتەوە، قفڵە ژەنگاوییەکانی سەر جەستەی مرۆڤەکان بشکێنێت و پێداچوونەوەیەك بەو ئایدۆلۆژیا و بۆچوونانە ببەخشێت کە لە دێرزەمانەوە دژایەتیی جەستەی پێ دەکەن،

شیعره‌کانی خاره قوباد ڕاسته چه‌قێکی شۆڕشگێڕانه‌یان هه‌یه، به‌ڵام بێبه‌ش نین له چێژ و جوانیی جه‌سته، ئه‌و جه‌سته‌یه‌ی له فیکری ئایینیدا ئامێری فریودانه، به‌ڵام لای قوباد کۆترێکی ماڵییه و زیان به کۆمه‌ڵگا و مێژوو ناگه‌یه‌نێت، شیعره‌کانی قوباد هه‌وڵێکه بۆ ئاشتبوونه‌وه‌ی مرۆڤ له‌گه‌ڵ جه‌سته‌دا و گێڕانه‌وه‌ی ڕێزه بۆ جه‌سته.

سه‌باره‌ت به ته‌وه‌ری ئیرۆتیکیش، ئه‌وا باسێکی ئاڵۆزه و زۆر جاریش بووه که بیرمه‌نده‌کان نه‌یانتوانیوه پێناسه‌یه‌کی زانستی بۆ بدۆزنه‌وه، چونکه ئیرۆتیك له شیعردا له که‌سێکه‌وه بۆ که‌سێکی تر ده‌گۆڕێت، به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ئیرۆتیك واتای به‌رهه‌مهێنانی چێژ ده‌گه‌یه‌نێت، سه‌باره‌ت به شیعر پێم وایه هیچ شتێك له بووندا قابیلی ئه‌وه نییه له جوانی و چێژی بکه‌یته‌وه. که‌چی قوباد پێی وایه بێجگه له ژن چریکه‌ی که‌ناری و زه‌ڕینی که‌ر وه‌کو یه‌کن، به‌و مانایه‌ی که قوباد چێژ ته‌نها له ژنه‌وه ده‌بینێت، یان ئه‌گه‌ر غه‌دری لێ نه‌که‌ین ده‌ڵێین: لای ئه‌و ژن تاکه سه‌رچاوه‌ی جوانییه، دواتر شته‌کانیتر له‌و سه‌رچاوه‌یه جوانی ده‌خوازن، بێگومان هه‌موو شاعیرێك مافی خۆیه‌تی که‌وا چه‌مکێك بکاته (من)ی گه‌ردوون، جا نیشتمان یان مرۆڤایه‌تی یان چه‌مکی تر هه‌رچییه‌ك بێت. به‌ڵام قسه له‌وه‌دایه که خودی زمانیش خۆی چێژ به‌رهه‌م دێنێت، ڕه‌نگه خاڵێکی نێگه‌تیڤانه‌ی خاره قوباد ئه‌وه بێت چێژ ته‌نها له مامه‌ڵه‌کردن له‌گه‌ڵ ژندا ده‌بینێت، به‌و واتایه‌ی ئه‌گه‌ر قوباد باسی ژن نه‌کات، ئه‌وا پێی وایه چێژ به‌رهه‌م نایه‌ت، له‌وه‌ش زیاتر قوباد له‌پێناو گه‌یاندنی

پەیامی خۆی بۆ ژن، لە ڕووی زمانەوە لە شیعردا کەمتەرخەمە، دەبووایە وەك چۆن قوباد داوای یاخیبوونی تێگەیشتن دەکات لەمەڕ تێڕوانینمان بۆ ژن، هەوڵیش دەدات ژن لە کۆت و پێوەندە باو و ئێکسپایەرەکان دەرباز بکات، ئاواش داوای نوێبوونەوەی تەکنیك و دارشتنی شیعر بکات و هەوڵیش بدات خودی شیعریش لە کۆت و پێوەندەکان دەرباز بکات. لێرەوەیە قوباد شەرعییەتی شیعرەکانی لە تەکنیك و زمانەوە وەرناگرێت، بەڵکو لە بابەتەوە دەیخوازێت، ئەوەی لە شیعریشدا دەمێنێتەوە بابەتەکان نین، بەڵکو تەکنیك و زمانە..

(١)

دەگێڕنەوە، کەسێك لە ئەبی تەمامی تائی دەپرسێت: تۆ بۆچی ئەوە دەڵێی کە تێی ناگەین؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: تۆ بۆچی لەوە ناگەیت کە دەگوترێ؟!

وێڕای ئەو هەموو گۆڕانکارییەی بەسەر پەیوەندیی نێوان نووسەر و خوێنەردا هاتووە، دەکرێت ئێستاش ئەمە دیالۆگی نێوان هەندێ نووسەر و خوێنەری ئێمە بن.

(٢)

ئایا قسە ناودارەکەی باروخ سپینۆزای فەیلەسووف چەندی ڕاستی تێدا ماوە کە دەیگوت: باڵاترین چاکە و ترۆپکی بەختەوەری بریتییە لە (خۆشیی زانین)؟

ئایا زانین هەمان چەمك و ئاراستەی فەلسەفی و زانستییانەی ماوە کە سپینۆزا مەبەستی بوو؟

خۆ بە تەنها خوێندنەوەی کتێبەکەی نعۆم چۆمسکی (٥٠١ ساڵ: داگیرکردن بەردەوامە) بەسە بۆ ئەوەی بزانیت ئەم جیهانە فێڵی مەزن بەڕێوەی دەبات، کاتێك باس لە ڕێکخراوە مرۆدۆستییەکان دەکا چی بەسەر کۆمەڵگاکان دێنن، لە ناردنی مار و سن و کیسەڵە و نەخۆشی و بڕینەوەی قاچ و دەست لە ڕێگەی خەستەخانەکانیانەوە لە ئەفغانستان و عێراق و کەمبۆدیا و لاوس و ڤێتنام، ئەوە کۆمپانیا گەورەکانی دەرمان و خوراردن لەولاوە بوەستن، جا چۆمسکی بۆچییە؟ خۆ قەیرانەکانی لای

خۆمان دوو نعۆم چۆمسكی دەوێ، لە قەیرانی توندڕەوی و پابەندبوون بە دەسەڵات و مووچە و سووتەمەنی و داخستنی گۆڤار و ڕۆژنامەكان و سەنتەرەكانی ڕووناكبیریی و نەمانی شانۆ و سینەما و هتد.. كاتژمێرێك سەیركردنی تەلەفزیۆن بەسە بۆ ئەوەی ئەو سێوە سوورەی دەتەوێ بیخۆیت لەگەڵ دیمەنی منداڵێكی ئاوارەی حەسەكە ببێتە سێوە حەرامەكەی ئادەم، بینینی منداڵێكی كلێنسفرۆش لە شەقامەكاندا كافییە تا هەتایە پێویستت بە كلێنس بێت بۆ سڕینەوەی ئاوێتەی تەڵخی ئەم ڕۆژگارە.

(٣)

سەیرە: ئێمە هەموو قەیرانەكانمان تاقی كردەوە تەنیا قەیرانی زەمان نەبێت، ئەوەی دەگوزەرێ لە ژیانی ڕۆژانەماندا هیچ لۆژیكێك نایگرێتەوە: دەتوانین ناوی بنێین شێتی و غیابی عەقڵ، هاوكاریی و هەماهەنگی لەگەڵ مێژووماندا دەكا، كەچی ئێستاش دەترسین لەوەی وڕێتە بنووسینەوە، لە تێكستدا پۆشتە و باو دەردەكەوین، دەترسین لەوەی زەمان لاستیك بێت و بە دەستمانەوە بپچڕێت، قسەی نەستەق دەڵێین و ئاوڕ لەو هەموو شێتییە ڕژاوەی دنیامان نادەینەوە، بە تایبەت گەر بزانین ئەو شێتییە سەرچاوەكەی لەو دەزگایانەوەیە كە بۆ ئەوە دروست كراون ژیان و زانینمان هاوتەریب بكا: هەر بۆ نموونە وەزارەتی ئەوقاف و وەزارەتی پەروەردە و فێركردن.

(٤)

شاعیران زۆربەیان (خەریکە بڵێم هەموویان) پەنا بۆ منداڵیی خۆیان دەبەن، وەك فریادڕەسێکی فەنتاسی و نیشاندانی خراپیی ئێستا و ئاییندەیان، بەس پرسیارێك:

ئایا دەتوانێ بەرەنگاری ئەو هەموو خراپەیەی لە دنیادا هەیە ببێتەوە، بەوەی منداڵ بمێنێتەوە؟

بێجگە لە بزووتنەوەی چەکداری، لە مێژووی کورددا کەی حسێب بۆ وشە کراوە (بێجگە لەو تێکستانەی لە کۆتاییدا تێکەڵ بە پڕۆژەی دەسەڵات بوونەتەوە)؟ ئەوە نییە بیست و چوار ساڵە قسە دەکەین و دەنووسین: هیچی گۆڕی؟!

خۆی هاوکێشەیەکی سادەیە، هەرچەندە زاڵمانەیە، کە بریتییە لەوەی: ئێمە ئەوەی پێمان خۆشە دەیڵێین، ئەوانیش ئەوەی پێیان خۆشە دەیکەن.

لێرەوە شاعیران لەو منداڵانە دەچن بەرد بگرنە دارێك کە نازانن بەردار نییە و دڵیان بەم یارییەش خۆشە.

(٥)

زۆربەی سوڵتان و پاشاکانی ئیسلامی و عوسمانی و سەفەوی و قاجاری شیعریان نووسیوە و دیوانیان هەیە، تەنانەت ستالین و کاسترۆ و سەدام حوسێن و عومەر تۆریخۆسیش، عیدی ئەمین و قەزافیش، ئەمەیە گەورەیی شیعر. تەنانەت تاوانبار و خوێنڕێژ و دیکتاتۆرەکانیش پەنا بۆ شیعر دەبەن، لەگەڵ ئەوەی لە ڕووی ئەخلاقیەوە ئینسان قێز لە دووڕوویی ئەو سەرکردانە دەکاتەوە،

بەڵام لە هەمــان کاتــدا دەبێــت شــاعیران بەوەوە بنــازن کە لە بەرەیەکی چەند جوانی هونەرین: کە شیعرە.

(٦)

هەموو، دێین و دەدوێین و بە دەمی پڕ وڕێنەوە،
هەر یەکە و گوایە کلیلێکی لایە:
بەڵام بۆ کامە دەرگا؟
مەگەر ئێمە لە بیابانی تەنیایی نین؟!
چما ئێمە دەرنەکراوین؟!



## کای ناو تابلۆکان

(١)

تۆ خەتاباریت ڕۆژهەڵات، باوکەکانت لەسەرچی شەڕیانە؟
خۆ باپیریان تەنیا خوێنی بە میراتیی جێ هێشتووە،
ئێمەش نەوەی وریا نەبووین:
کای سەری ئەوانمان بە گوڵەگەنم خستە تابلۆکانەوە.

(٢)

ئەو کاروانی مێژووە، پێشتر هەر دەهات و دەچوو،
لە دەرزی و دەزوو دەچوو:
لە باکوورەوە بۆ باشوور، لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا،
سنووری دەدوورییەوە و برینی پینە دەکرد:
ئێستا حەملەدارەکەی، چوار پارچەکەی لێ بۆتە چوار پای سیسەم و
لەسەریدا پاڵکەوتووە.

(٣)

بە قەلغانی تەنەکەوە، کێ دەگاتە ئاڵتوونی خۆر؟
گەر ئەو هەموو حەکیم و حیکمەتەمان هەیە.
ئەی بە قسە و هەناسەی کێ ڕۆژگارمان ژەنگی گرتووە؟!

(٤)

خوێنەر، باخچە و سەربازگە دەناسێتەوە:

دەزانێ (کێ بە گوڵ دەڵێ خانم) و
کێیش، مانا لە ئەبجەدیەتی ڕادەکا و
پارچەی جامانە، وا بەسەر تەلبەندی وشەکانییەوە.

(٥)

مێژووی ئێمە پەیوەندی بە ژیانەوە نییە:
نموونەی ناوێ.. (بەڵام با بڵێین شەنگال)
بۆ ئەوەی نەمر بیت، یەکەم شت دەبێ بمریت.

(٦)

باوکمان ژنێکی دیکەی هێنا
تارای جەمەدانییە و موعتەری نەوتاوی لەژێر باڵ داوە
بووە حوشترەوانی کوڕەکانی هاجەر و
ئێمە و دایکمانی لای کانییەکی وشك جێ هێشت
ئیسماعیلی هەموو کێردەکانین و کەسیش بەرانێك نانێرێ.

(٧)

ئەو هەموو چیایەمان هەبوو، مووسایەك نەچووە سەری
ئەو هەموو لافاوە هات و نووحێك دەربازی نەکردین
ئەو هەموو شاعیرە و ئاگرێکمان پێ نەدزرا
پشتمان لە پشتمان کرد و خەریکی دروستکردنی قامچی بووین.
سکمان بە پێمان نەسووتا

بەدیار پارچەی شکاوی ئەو پلیکانەیە دانیشتووین
کە بڕیار بوو بەرەو فیردەوسمان ببا.

(٨)

دوای ئەو هەموو نایەکسانییە، زمان نایەوێ باوەڕکا
کە ڕۆژ بە ڕۆژ بیانووی بێدەنگبوون زۆرتر دەبێ.

(٩)

ئەگەر ئاواز شایەتی بۆ تێکست بدا
ئەوسا تێدەگەین:
لە مێژوومان، سالم مەقامی عەجەمی داهێنا
کوردی مەقامی هیجران و
نالییش حیجاز.



کەمێك لە ژیان زیاتر
کەمێك لە مردن کەمتر

(١)

هەموو ئەو نووسەرە باشانەی بەرهەمەکانیان دەخوێنینەوە، وێڕای جیاوازییان لە دنیابینی و فۆرم و داڕشتنی ئەدەبییان، لە شتێکدا کۆکن: ئەوەی کە ئینسان لەم هەسارەی ئێمەدا (کە بەراورد بە گەردوون بچووکترە لەوەی شایەنی باس بێت)، لەگەڵ گەردوونێك مامەڵە دەکات کە هیچ پەیامێکی پێ نییە، ئایین و یاسایش تەنیا بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی نەبوونی پەیامە. لێرەوە، دەبێ مەدوای ئەدەب و ڕووناکبیری چی بێت؟ ئەوەیە کە کۆلن ویلسن دەیڵێت (هەموومان ڕوانینی کرمیمان هەیە و ناتوانین ببینە باڵندە و گاڵتە بەو سانتیمەترانە بکەین کە دەیبینین؟)، یان ئەوەیە لە شێوەی دیستۆفسکی تەسلیمی تەنیایی بین و بڵێین: تاکە کەس شایەن بێت لە گەڵیدا بژیت، تەنیا خۆتیت؟)، یان وەکو وجودیەکان باوەڕ بە دۆزەخی (ئەوانیتر) بکەین و لە تەك ئۆکتافیۆ پازدا بنووسین (ژیان قەت هی من نەبووە، ژیان هی ئەوانی ترە کە ئێمەین!). ئایا ئەدەب و ڕووناکبیری ئێمە لە کوێی ئەو هەستە سیزیفیانەی (ئەحمەد شاملوو)ەوەیە کە پێی وابوو هەمیشە و تا ئەبەد (بەردی وشەکان بەرەو بەرزاییەکانی مانا ببات و لێی خلۆر بێتەوە، بیباتەوە و لێی خلۆر بێتەوە؟).

لەوانەیە گرفتی سەرەکی ئەدەبی ئێمە ئەوە بێت کە هەمیشە مانادار بووە، وێڕای ئەو هەموو بێ مانایەی سەراپای ژیان و مێژووی تەنیوین، غیابی عەقڵ و لۆژیك بە ئاشکرا بە مێژوومانەوە دیارە (وەکو نەتەوە و لەسەر ئاستی ئینسانیش)، ئەو هەموو

ناهەقییەی بەسەر ئێمەدا هاتووە، وای کردووە شێتیی ژنە بەوەفاکەی ڕۆژگارمان بێت، ئەدی ئەو هەموو قسەی نەستەقە چییە لە ئەدیباتمان دەبارێ؟! ئەو هەموو ئەزموونی شێتییە و ئەو هەموو نووسینەوەی حیکمەتە چۆن یەکیان گرتەوە؟! کە ناهەقی و ناعەقلانییەت، یاوەری بەردەوامی ئینسانی کورد بووە و موعاناتی پێ بەخشیوە؟! ئەدی بۆ درزێکی نەخستە دیواری زمان و ئەبجەدیەتمانەوە؟!

(٢)

إذا مـا تأمّلـتَ الزّمـانَ وصَرْفَـهُ
تيَقّنْـتَ أنّ المـوْتَ ضرْبٌ مـن القتـلِ

(ئەگەر لە زەمان و هەڵسوکەوتەکانی وردبیتەوە،
تێدەگەی مردن جۆرێکی ترە لە کوشتن)

ئەم دوو دێڕەی موتەنەبی، هەرچەندە هەزار ساڵ لەمەوپێش نووسراوە، دەکرێت ببێتە ناونیشانی زۆربەی هەرە زۆری ئەدەبیاتی سەدەی بیستەم، نووزەیەکی نزمی ئینسانییە بەرانبەر بە ژیان و گەردوون، بەرانبەر بە پیربوون و غەدرەکانی دنیا، بە نەزانین وماڵئاوایی لە گەیشتن بە ئەنجامێکی بەردار. کورتکردنەوەی تێرامانی ئەو فەیلەسووفانەیە بەرانبەر بە بۆشایی ئاسمان شەویان دەگوزەراند و ڕۆژیان دەکردەوە. چڕکردنەوەی (وێرانە خاك)ی ئالیۆتە لەوەی (ئێمە نەژیاین، بەڵکو گوزەراین).

هەزار ساڵەی تەنیایی موتەنەبییە پێش ئەوەی مارکیز سەد ساڵ تەنیایی بنووسێت. ئەندێشەی مەسعود محەمەدە کە ناچارە چەندین کتێب لەبارەی وێڵی و ئاوارەیی نالی و حاجی قادر بنووسێت، بەبێ ئەوەی زەمانە سەرچاوەیەکی تاقانەی بۆ جێ بێڵێت. لێرەوە هێمن موکریانی دەست لەوە دەشوات لەسەر کێکی تەمەن هەڵکا مۆمێکی تر.

سەیر نییە؟.. هەزار ساڵ لەمەو پێش وەك ئەوەی (موتەنەبی) باپیرە گەورەی شکسپیر و بۆدلێر و نالی و کامۆ و هێمن موکریانی و تۆماس سیرنز ئالیۆت و مەسعوود محەمەد و گارسیا مارکیز بووبێت، باس لە مەرگ و غەدری زەمانە دەکا و دەبێتە عەرابی پووچگەرایی.

(٣)

ئەستێرەیەك لە ئاسمانەوە دەڕژێت و کەس ناتوانێت بپرسێت بۆ ڕژا؟ یان هێزێك هەیە پێی گوتبێت بڕژێ؟ ئەی ئەستێرەیەکی تر بۆ ناڕژێ؟ کەس دەتوانێت لێی بپرسێت بۆ نەڕژای؟ یان هێزێك هەیە لە گەردووندا پێی گوتبێت مەڕژێ؟ بەم پرسیارانە باوکی وجوودیەکانم بیردێتەوە، فەیلەسووفی دانیمارکی (سۆرین کیرکیگارد). تازە هەراش دەبووم و لەژێر قەلاتی هەولێردا کتێبێکی بەرگ دڕاوم دەسکەوت بەناوی (گێرەشێوێن)، تیایدا دەیگوت: (گەر پەنجەت بخەیتە ناو خۆڵەوە، بە بۆنەکەی دەزانیت ئینتیمات بۆ ئەو زەوییە هەیە کە لەسەری وەستاویت، من پەنجەم دەخەمە ناو بوونەوە، بۆنی هیچ نادات! من کێم؟ لە

کوێم؟ گەر ئەکتەرم لەم دنیایە کوا دەرهێنەر؟ دەمەوێ ببینم). محیێدین بن عەرەبیم بیردێتەوە کە دەیگوت: (خودا نە وشەیە و نە مەعنا: خودا ڕەنگە و چاو و ڕوانینی تایبەت دەیبینێت)، نە وشەیە واتا قورئان نییە و نە مەعنایە واتا شەریعەت نییە. لێرەوە گرنگیی ئەوە دەردەکەوێت ئەدەب و نووسین نمایشی شتە شەخسییەکان نەبێت و مۆسیقایەکی هێمن لە پشتییەوە بڕوات، پرسیار و گومان بێت بە ڕووی ئەو بۆشاییە لەبن نەهاتووەی نەزانیمان ڕێ بکا، گرنگە ئێمەیش عاتیفە بە کۆڵەگەیەکی سەرەکی ئەدەبیات نەزانین (ئەوروپییەکان لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوو ئەمەیان کرد). بەرەو نەهامەتی و ونبوون بڕۆین: نەهامەتی مێژوومان و ونبوون لەناو دارستانەکانی زماندا، گرنگی بە جەوهەری دنیا بدەین، وەکو مەقامبێژێکی عێراقی لە لێواری بەجێهێشتنی هەموو شتەکاندا بین، هەردەم لە سێبەری یادەوەرییەکانیدا دەنگ هەڵبڕین، هاوارمان بریتی بێت لە ئەنجامی هاوکێشەی ئامادەکارییەکانی خواحافیزیکردن لە هەموو شتێك: لە یارەکان، لە مووی قەترانی، لە ددانی ساغ و خەوتنی زۆر، لە بەختەوەری.

نالی لەم دەردە نازدارەی پرسیار و گومان گەیشتبوو بۆیە نەبووە شاعیری ژن بە تەنها، نەبووە شاعیری نەتەوەیی بە تەنها، نەبووە شاعیری هەجوو بە تەنها، نەبووە شاعیری ئەمارەتێك بە تەنها، لێرەوەیە ئەدیب نابێتە دەستەمۆی گوتارێك، یان ئایدیایەك، یان چینێك: یەکسان دەبێ بە دنیا و دنیایش یەکسان دەبێ بە ئەو.

(١)

**بە ڕۆژ: چێشتی باش دەخۆین**
**وێنەی جوان دەگرین**
**سەیرانی خۆش دەکەین.**
**بە شەو: لەبارەی تەنیایی و**
**مردن و عەدەمەوە دەنووسین.**
**ئەمەیە دنیابینیمان؟**
**ئەمەیە ڕووناکبیریمان؟**

ئایا ڕاستە شیزۆفرینیا و لێکدڕییەکان، ژیانی ئێمەی تەنیوە؟ بە ڕۆژ جۆرێکین و بە شەویش جۆرێکی تر؟ بۆچی لەناو ڕۆشنبیرانماندا چالاکی و ئەکتیڤیتیی کۆمەڵایەتی کەمە یان هەر ونە؟ بۆچی ئەدیبێك یان هونەرمەندێك لە کۆڕێك یان تەنانەت لە چایخانەیەکدا ئامادە نییە بە ڕووی سەلەفییەکدا بێتە وەڵام کە ئەدەب و هونەر بە حەرام دەزانێت و خوێنیان حەڵاڵ دەکات؟ کە شەویش دادێت ئەدیبەکە تێکستی بەرگری بۆ نەبەردییەکانی کۆبانێ و خۆڕاگرییەکانی خۆپیشاندەرانی مەهاباد دەنووسێت و هونەرمەندەکەیش گوێ لە میوزیکی خەیامی و دۆزەخییان دەگرێت و دەیەوێت بە مەی کفنی تەڕ بکەن؟! باوەڕم هەیە کە ئینسان لە شێوەی پرتەقاڵە: سەنتەری نییە و هەموو شوێنێکی سەنتەرە، ئایا ئەوەیە کە هاشم سەراجی شاعیر دەیڵێ بەوەی ئینسان لە نێوان دڵخۆشی و دڵتەنگیدا گیری خواردووە؟ من لەسەرمە پرسیار بکەم، خۆ پرسیاریش بە قەد ژمارەی ئەوانەی لێیان دەکرێت، وەڵامی هەیە.

(٢)

**مەلاکان، زاناکان، ئەدیبەکان، سیاسییەکان**
**هونەرمەندان، مێژوونووسان**
**هەموو دێن و دەدوێن و بە دەمی پڕ کەفەوە**
**هەر یەکە و گوایە کلیلێکی لایە**
**بەڵام بۆ کامە دەرگا؟!**
**مەگەر ئێمە لە بیابانی تەنیایی نین؟!**
**چما ئێمە دەرنەکراوین؟!**

هەردەم وا بـاو بـووە کە دەرگـا زۆرن و ئەرکمـانە تەنیـا کلیلەکان بدۆزینەوە، لە ئێستای کۆمەڵگەی ئێمەدا دەڵێی کارەکە پـێچەوانە بـۆتەوە، کلیلەکـان زۆرن و دەرگـا دیـار نـیـە، لەسـەر ئاسـتی نەتەوەیـی، جەمـاوەری، ڕوونـاکبیری، مێژوویـی، لە مامەڵەمـان لەگەڵ دنیـا، لەگەڵ زانسـت، قەرەبـاڵغییەکی زۆر لە چـاودێری سیاسـی، لە ڕەخنەگـری ئەدەبیـی، لە نووسـەری فەلسەفی، پەروەردەیـی، ئـابووریی، کەچـی هیچمـان دیـار نـیـە، هەموو ئەو جۆگەلانە دەڕژێنە ناو ڕووبارێك پێی دەڵـێن گلەیـی: گلەیی لە هەموو شت، گلەیـی لە هەمـوو کەس. خـۆ نەك لەنـاو گەلان و نەتەوەیەکگرتووەکان و... کـورد لە مێـژوو دەرکـراوە، کار گەیشتۆتە ئەوەی خودی کورد لەناو کوردایەتیدا هەسـت بە تەنیایی و دەرکراوی بکات، ئەوە ئەگەر لەناو ئەم چوارچێوەیەدا دەرنەچـین و نەپەڕیـنەوە بـۆ بەهێزتـرین و بەربڵاوتـرین ڕەوتـی فەلسەفی لە ماوەی سەد سـاڵی ڕابـردووی جیهانـدا کە بـریتییە لە ڕەوتی بێهودەیی و پووچگەرایی.

**(٣)**

**بیرمە بەیانیان**
**داپیرەم لە بنی بنەوەی نوێتەکان**
**خەمی قەد دەکرد..**
**دڵی لام بوو لە دەرەوە ون نەبم**
**نەیدەزانی ونبون لە ناوەوەیە.**

ئینسـان تـا گەورە دەبێـت، بەرەبەرە بەڕائەت لەدەسـت دەدا، گەورە دەبێت؟! بۆ چەند دەژی؟! خاترت بگرم سەد ساڵ.. لەناو ئەو گەردوونەی گەردێك نییە لە ملیارەها گەردوونی تر

زوو یا درەنگ تێدەگا چەمکەکانی خێـزان و خێـڵ و نەتەوە لە شێوەی ترسی ئەو ئەسپانەیە کە لە تەنیشت یەکـدا ڕیـز دەبـن بـۆ بەرگریکـردن لە خۆیـان، ئەو قەرەبـاڵغییە بـێجگە لە بـوونی چارەنووسـی هـاوبەش هیچـی تـر نیـیە، بە مانـایەکی تـر، هەر یەکەمـان لەو چارەنووسـە دەترسـێت نەوەك بە تەنیـا یەخەی بگرێت، ئەوەی باشـە هەمووماـن لەسـەر ئەوە کـۆکین کە تەمەن زۆر لەوە کـورتترە خۆمـان بـدۆزینەوە و لە ونبـوونی ناوەوەمـان دەربازمان بێت، کەواتە با هەر یەکە و ڕێـزی ئەسـپی ڕیـزەکەی خۆی بگرێت.

(٤)

لەم وڵاتەی تیایدا دەرمانەکانیش نەخۆشن
دەبێ ڕاست بێت
ئەو دەسەڵاتەی لای خەڵکە
مەزنترە لەو خەڵکەی لای دەسەڵاتە؟
دڵگرانم بەوەی ئەو وەڵامەی لای منە، مێژوو پێچەوانەکەی سەلماندووە!

(١)

جـان کـۆهین لە کتێبەکەیـدا (خلیسـکان لە زمـانی شـیعریدا) بـاس لە لادان و خلیسـکانی زمـانەوانی لە شـیعردا دەکـات وەك کۆڵەگەیەگی سەرەکی بەشیعربوونی هەر تێکستێك، بەو مانایـای ئەوەی لە زمان و ئاخاوتندا ڕێگەی پـێ نـادرێ، ئەوا لە شـیعردا دەبێتە توخمێکی سەرەکی، زمانی شـیعری بـۆی هەیە لە مۆراڵی زمـان و ئاخاوتنـدا دەربچێـت، لە زمانـدا بەرد تەنیـا واتـای بەرد دەگەیەنێـت، بەڵام لە شـیعردا ئاسـۆی لێکـدانەوەی بێسـنوورە. لە ئاخاوتنـدا ناتوانرێـت بگوترێـت خـۆڵم فـڕ کـرد، یـان ئەسـتێرەم خواردەوە، بەڵام لە شیعردا ئەو ڕێسایە بە ئاسـانی دەشـکێندرێت. ئەمەیە ئازادیی تەواوی بەخشیوەتە شیعر بە مەرجی بەرهەمهێنـانی چێژ و سـتاتیکا، ئەوی لێرەدا پێم سـەیرە و کەس ئامـاژەی پـێ نەداوە، ئەوەیە شاعیرێکی وەکو عەبدوڵلا گۆران بەبـێ ئەوەی لە زۆربەی شیعرەکانیدا خلیسکان لە زماندا ئەنجام بـدا: شـیعری پـڕ چێـژ و سـتاتیکای نووسـیوە، تەنـانەت زۆر جـار ئەو نـیمچە ئازادییەی لە ئاخاوتنیشـدا هەیە پێویسـتی پـێ نییە و ئـاوڕی لـێ نـاداتەوە. سـەدان دێـڕە شـیعری هەیە لە ئاخـاوتنیش بێگرێتـرن، کەچی نکۆڵی لە شیعربوونیان ناکرێ:

(بە ئاسمانەوە ئەستێرەم دیوە/ جادە چۆڵ و سێبەر بـوو کـاتی بەیـانی/ زۆر قـژی زەرد سـەرنجی ڕاکێشـاوم/ و هتـد..)، بە گەڕانێکی کەم لە دیوانەکەیدا سەدان ڕستەی لەم شێوە دەست دەکەوێ، کە بەبـێ بـوونی لادان و خلیسـکان لە زمـان و

ئاخاوتندا، گۆران توانیویەتی شیعر و شیعرییەت بەرهەم بێنێت، ئەویش بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەو کۆڵەگە گرنگەی مێژووی شیعر کە بریتییە لە خلیسکانی زمان.

(٢)

ئەوەندی لەبارەی شیعرەکانی گۆرانەوە نووسرابێت و من خوێندبێتمەوە، هەموویان بەرهەمی شیعریی گۆران وەك فۆتۆگرافەرێك پێناسە دەکەن، بەبێ ئەوەی ڕەگەز و توخمەکانی ئەو ئاراستەیە شرۆڤە بکەن. پێشم وایە ئەمە تەمبەڵترین کارە کرابێت، چونکە وێنای کردنی گۆران تەنیا وەك فۆتۆگرافەرێکی سروشت، لەکۆڵخۆکردنەوەی گەڕان و وردبوونەوەیە، وەك ئەوەیە بە کەسێك بڵێیت باشە یان خراپە، بێ ئەوەی دیتێل و وردەکارییەکانی ئەو باشە و خراپەیەی دەستنیشان بکەیت. ڕاستە گۆران هێزی وێناکردنی سروشتی بەهێزە، بەڵام لە پشت ئەو کارەیەوە، گواستنەوەیەکی جۆریی هەیە بۆ شیعری کوردی، پێش گۆران (تەنانەت دوای ئەویش لە نموونەی شێرکۆ بێکەس و عەبدوڵڵا پەشێو و لەتیف هەڵمەت)، شیعری کوردی، شیعری بیروڕا بوو، سەکۆیەك بووە بۆ هاوار، بۆچوون و هەڵوێست بوو. شاعیر بێلایەن نەبوو بەرامبەر بە سروشت. شێرکۆ بێکەس لە شیعردا بەرد دێنێ، دار دێنێ، بەڵام لەسەر جوانی دار و بەرد ناوەستێ، بەڵکو دەیکاتە ئامرازێك بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی

هەڵوێستی دەیخوازێت، پەشێویش هەروەها کەمترین شیعری بۆ شتەکان نووسیوە، بەرهەمەکانی لایەنگرن، تەڕەفگیرن. گۆران بێلایەنە (تەنانەت ئەو کاتەی دەبێتە لایەنگیر و دەیەوێت هەڵوێست تۆمار بکات خراپترین شیعر دەنووسێت، وەك تێکستەکانی: چواردەی تەممووز، لاوکی سوور بۆ کۆریای ئازا، ڕێگای لینین، بۆ سەربازی جمهووریمان و هتد..) لە گۆرانەوە سەرەتاکانی شیعری شت دەست پێ دەکا، پێشتر و لەگەڵ ئەویشدا شیعرەکانی قانع و حەریق و حەمدی و ناری و ئەسیری هەر وەك شیعری بیروڕا دەمێننەوە. مەترسیی شیعری هەڵوێست لەوەدایە تەڕەفگیرە، واتا بەشێك لەگەڵیدان و بەشێکیش لە خەڵك دژی دەوەستنەوە، جار بووە هەندێ شیعری هەڵوێست و بیروڕا بەپێی تێپەڕبوونی کات هیچ نرخێکی ئەفراندنیان نەماوە و بوونەتە دیکۆمێنتێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتیی ڕووت، وەك هەندێ لە شیعرەکانی فایەق بێکەس لەبارەی لادانی پەچە و دەرپەڕاندنی ئینگلیزەوە. چاکەی گۆران لەسەر شیعری تازەی کوردی تەنیا گەڕانەوە نەبووە بۆ کێشی خۆماڵی و نووسینی شیعری ئازاد، بەڵکو پەڕیوەتەوە بۆ هێنانەدی ڕامانی نوێ بۆ شتەکان. گۆران لەسەر بەرد دەوەستێ و نایشێوێنێت، سروشت خۆی دەبێتە ئامراز و هەر خۆیشی دەبێتە ئامانج. دیدی بۆ جوانی، دیدێکی بێلایەنە و گۆران بە قەد مەودای خوێنەرەکانی لە شتەکانەوە نزیکە و هەر هێندەی ئەوانیش دوورە. شتەکان لە شیعری پێش گۆراندا بوونیان بەو شێوەیە نەبوو ببنە چەق و

سەنتەری بینین و تێڕامان، پێش گۆران شتەکان لەناو تێکستدا تەنیا لە خزمەتی دروستکردنی مانا بوون، لە شێوەی خشتێك دەچوون دیواری هەڵوێستی پێ بچنرێت.

(٣)

بەڵگەیەك نییە کەوا گۆران بە ئاگاییەوە شیعری لە بیروڕاوە گواستبێتەوە بۆ شیعری شتەکان، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەڵگە هەیە کەوا ئەویش ختووکەی مانا و هەڵوێستی هەبووە، ئەو شیعرە خراپە سیاسییانەی شایەتن، لەمەدا زۆر لە بەدر شاکر سەیاب دەچێت، سەیابیش لە سیاسەتدا زۆر ساویلکە دەهاتە بەرچاو، کاتێ کتێبەکەی دەخوێنیتەوە (من شیوعی بووم) ئینجا دەزانیت بەس لەبەر ئەوەی بۆتە شیوعی، چونکە ویستوویەتی لەبەری خەڵکی زەحمەتکێشدا بێت، ساویلکە و ڕۆمانسییانە لە سیاسەت و شۆڕشی ڕووانیوە، کە دواتر ڕووبەڕووی گەندەڵییەکانی سیاسەت و سیاسەتمەداران بۆتەوە، چەند بەستەزمانانە دان بە ساویلکەیی خۆیدا دەنێت، گۆرانیش هەر بەو ستایلە ڕۆمانسی و ساویلکەییە بۆتە لایەنگیری شیوعی و شۆڕشەوە. لەگەڵ ئەمانەشدا هەڵوێستییان بەدەر نەبووە لەوەی زانیوییانە شیوعییەکان دەتوانن شاعیر دروست بکەن و شاعیر نغرۆ بکەن.

(١)

کورد وەك چۆن لە جیهاندا لە سۆنگەی سۆز و بەزەیی بۆ نەتەوەیەکی مەینەتبەش سەیری کراوە، ئاواش سەیری ئەدەب و هونەری کراوە، کە ئەدەب و هونەری نەتەوەیەکی زوڵملێکراوە، بۆیە دەبینی یەکدوو شاعیری کورد بە درێژایی مێژوو تەنیا خەڵاتی تۆختۆلسکیان وەرگرتووە، ئەو خەڵاتەش دوور و نزیك نرخ و بەهای هونەریی نییە، بەڵکو خەڵاتی دابینکردنی بژێوییە، لەوێشدا هەر لە کونی دەرگای بەزەیی و عەتفەوە تەماشای ئەدەب و هونەرمان کراوە، بۆیە دەبینی ئێمە شاعیری پلە یەك و هونەرمەندی پلە یەکمان کەمە، چونکە ئەوە پەیوەندی بە تەبەنیکردنی دەزگای جیهانیی گەورەوە هەیە بۆ وەرگێڕان و بڵاوکردنەوە، پێم وایە چەندین ساڵی دیکەش شاعیرێکی باشی کورد نابینی دەقەکانی وەرگێڕدرێن بۆ زمانەکانی دنیا و بە هەند وەربگیرێت، ئەوان تەنیا پێوستیان بەو شیعرانە هەیە کە باشترین نموونەی پاڕانەوەی کوردن لە خۆرئاوا، جیهانیش بە شوێن جوانییەکانی کورددا ناگەڕێت، هێندەی نەغمەی ئەو نووسینانەی پێ خۆشە کە وەك فریادڕەس وێنای دەکات.

(٢)

بوونی مانیفێستی ئەدەبی، بۆ مێژوو زۆر گرنگە. ئەدیبانی ئێمە بە باشی ئاوڕیان لە بەهای بڵاوکردنەوەی مانیفێست نەداوەتەوە. زۆربەی ئاراستە و ڕەوتە ئەدەبییەکان لە دوای مانیفێستەوە خۆیان سەلماندووە و بوونەتە قۆناغێکی جیا لەوانی پێش خۆیان. لە دەرەوەی ئەو بەهایە گەر بێینە سەر تێپەڕاندن، ئەوا من پێم وایە هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆ نییە لە نێوان بەرهەمەکانی پێش و پاش بڵاوکردنەوەی مانیفێستەکان. بۆ نموونە جیاوازیی شیعرێکی شێرکۆ بێکەس چییە لە پێش و لە دوای بڵاوکردنەوەی مانیفێستی ڕوانگە؟ بێگومان هیچ. حسێن عارف دوای بڵاوکردنەوەی مانیفێستی ڕوانگە ئایا زمان و داڕشتن و تەکنیکی چیرۆکەکانی گۆڕا؟ بێگومان نەخێر. خۆ دوای ڕوانگە جەلالی میرزا کەریم شیعری جیاوازی نەنووسی. بەڵام ناکرێت لە مێژووی شیعری تازەی کوردیدا باس لە گرنگیی مانیفێستی ڕوانگە نەکرێت، هەرچەندە بۆ خودی بەرهەمی ئیمزاکەرانی مانیفێستەکەش هیچ ئیزافەیەکی ئیبداعی نەبوو، بەڵام هەر بەهای مێژووی خۆی پاراستووە.

(٣)

نەك ئاشتەوایی كۆمەڵایەتی، بەڵكو وێرانبوون و ئاژاوەیش لە دەستی ژن دایە، بیرمان نەچێ بە پێی ئەفسانەكانیش ساتی دروستبوونی دنیا لە ڕێی ژنەوە بووە، بەپێی ئایین و ئەفسانەكانیش بێت، ئەوا ژن لە پەراسووی پیاوەوە دروست بووە، كەواتە كاتێك بیر لە ژنێك دەكەینەوە، ئەوا بیرمان بۆ شتێكی نامۆ نەچووە، ئەو پەراسووی خۆمانە، ئەو ژنەی لە شیعردایە بە تەنیا تاكە ژنێك نییە، ڕاستی، كۆكەرەوەی هەموو ئەو ژنانەیە لە ژیانماندا خۆشمان ویستوون، ئەو ژنە لە شێوەی ئاسمانێكە جێی سەری هەموو پیاوەكانی لێ دەبێتەوە. ئەو ژنە پاساو دەداتە ئادەم كە ناهەق نەبووە سێوێكی لە دەست وەرگرتووە و خواردوویەتی و بەهەشتی لەدەست داوە، هەقبوو نەك سێو: باینجانیشی بە خاوی بخواردایە. ژن سەراپای زانست ئاوەژوو دەكاتەوە، دەیسەلمێنێ كە تیۆرەكەی داروین هەڵەیە و ئینسان لە پەپوولەوە گەشەی كردووە نەك لە مەیموون! جیاوازیی نێوان ئەو ژنەی ناو تێكستەكان و ئەوانەی ناسیومانن، جیاوازی نێوان جۆگەلە و ئاوی ناو بوتڵە، ئاوی ناو بوتڵ ڕاستە پاك و جوان و پۆشتەیە و بە عاقڵی و بە ئەدەبەوە لەسەر مێز دانیشتووە، بەڵام ئاوێكی زیندانییە، كەچی ئاوی جۆگەلە و كانی، ئاوێكە بە ئارەزووی خۆی دەڕژێ و دەپرژێ و شێتانە ئاراستە وەردەگرێ.

(٤)

ئەمەم لە زۆر کەس بیستووە کە قسەی نەستەق کۆڵەگەی ئاشتەوایی مرۆڤەکانە، دیسان من بە پێچەوانەی دەبینم، تەمبەڵترین و کۆنخوازترین قسە بۆ ڕووناکبیر، گرتنەبەری ڕێگەی گەڕانە بە شوێن دارشتنی قسەی نەستەق، چونکە قسەی نەستەق فیکرێکی هاوبەشە، فیکرێکی گشتگیرە و بۆتە کۆڵەگەی ئەو کەسانەی نەیاری نوێخوازین، ئەو کەسانەی دەیانەوێ یاسا و ڕێساکان وەکو خۆیان بمێننەوە، چۆن دەکرێت ئەدەب وەك کارێکی زاتی و فەردانی، لەسەر فکرێکی دەستەجەمعی بنیاد بنرێت؟ فکرێك کە هەموو بناغەکەی لەسەر ئەوە بنیاد نراوە (دەست بە کڵاوی خۆتەوە بگریت) و کەسێکی شیاو بیت لەناو دابونەریتێکی نەشیاو، قسەی نەستەق: قسەی ئەوانەیە نایانەوێ ئینسان و جیهان بگۆڕێت و پێش بکەوێ، قسەی نەستەق ڕاکشاندنی بە زۆری ئێستا و ئایندەیە لەناو قەبری ڕابردوودا، گەڕاندنەوەی ئەبجەدییەتە بۆ ناو فەرهەنگی ڕابردووخوازی. بێجگە لە لەناوبردنی گەڕان و دۆزینەوە، بێجگە لەوەی تاك لە پشت دیواری قسەی ئەوانیترەوە سەنگەر بگرێ، پەند و حیکمەت یانی چی؟!

(٥)

له زۆر کەسم بیستووە کە کورد پەند لە مێژوو وەرناگرێت و سوودی لێ نابینێت، من بە پێچەوانەی دەبینم.. کورد هەمیشە باس لە مێژوویێك دەکا کە بە سوودە.. کە قازانجی بۆ ئەوە هەبووە وا تێبگات زیرەکترین نەتەوەی دنیایە. خوێندنەوەی مێژوو دەبێ زیان بە بیرکردنەوە بگەیەنێت، زیان بە باو و زانراو و ناسراوی کۆمەڵ بگەیەنێت، ڕاستیی لای کورد هەمیشە بە سوود بووە. خۆی دەبێت ڕاستی بریندارکەر بێت نەك ئارامبەخش.



فرەیی ڕووناکبیری لە کەرکووک
پڕبوونێک یەکسانە بە بەتاڵبوون

لەوێ.. لە کەرکووك.. کەسانێك هەن گەر بۆیان بلوێ، نەك هەر ئایندە لەبار دەبەن، بەڵکو بەبەرچاوی نوقاوی منداڵێکی تیرۆرکراوەوە، زلـلە لە ڕووناکی دەوەشێنن و پێڵوی سپێدە، هەموو سپێدەکان کوێر دەکەنەوە. ئەو کەسانە نەوەی ئەشکەوت و دۆستی تاریکی و خزمی ناشیرینین! گوێ لە مۆسیقا ناگرن و نەیاری کلکی تاوس و دوژمنی ئەو مێروولانەشن کە دوای خۆشکردنەوەی باران دەردەکەون! چاویان بە بینینی چۆلەکەیەك هەڵنایێ حەز لە دار هەنجیرێك بکات! دڵیان هێلانەیەکی پووش وشکی خراپەیە، خەونی گەورەیان تەئجیلکردنی ژیانە. شیعر لە ئاست ئەو هەموو کۆستەدا چی بکات؟ کیمیای شیعر هاوکێشەی بە ئەنجام گەیاندنی خوێن نییە! هاوکێشەی کەرکووکیش زۆر لە هاوکێشەی بیابان دەچێت: تا چاو بڕ دەکا لم و بۆشاییە! لێرەوە شیعر دەکرێت بە تەلبەندێك پارچە جامانەیەکی سووتاوی پێوە دەشنێتەوە! هەموو چیرۆکی دنیا وەسفی ساوایەکی پێ ناکرێت کاتێك نارنجۆکی لێ دەکەن بە مەمك! لە کەرکووکدا، لە نێوانی دەمی ساوایەك و مەمکی دایکێك، مردن هەیە. لە نێوان قەڵەمی ڕۆژنامەنووسێك و ڕاستیدا، خوێن هەیە. لە نێوانی وتەی مامۆستایەك و گوێی قوتابییەکدا، مێژووی ترس هەیە. لە نێوان ئەدەب و جوانیدا، دیوار هەیە. لە کەرکووکدا هەموو دایکەکان دڵنیان منداڵەکانیان لە کۆڵاندا بە پایسکلی سێ تایە یاری لەگەڵ مەرگدا دەکەن! منداڵەکانیش دڵنیان لەوەی ڕێی تێدەچێت ئەو کیلۆ پرتەقاڵەی

دەستی باوکیان خوێناوی بکرێت و ببێتە سێوە لاسوورە. لە کەرکووکدا مەرگ، لە سووری بڕنجە سوورەش دایە. مەرگ وەکو گوڵەبەڕۆژە بە شوێن هەتاوی سەر ئاڵای کوردان دەسوورێتەوە. تەنیا لە کەرکووك، ژنەکان لە پەراسووی پیاوەوە خەڵق نەکراون، بەڵکو لە پەراسووی گریان. تەنیا لە کەرکووك، منداڵەکان گرنگ نییە بە نۆ مانگی لە دایك بن، بەڵکو نۆ مانگ بژین. تەنیا لە کەرکووك، پیاوەکان بەس نییە پیاو بن، بەڵکو قەقنەس و لە خۆڵەمێشدا زیندوو ببنەوە. ئەو هەموو بۆشاییە بە سەرابیش پڕ ناکرێتەوە! ئەو هەموو لافیتە ڕەشە بەشی گیرانی دوو خۆر دەکات! ئومێدمان بە جوانییەکانی شیعر و مۆسیقا هەیە کەرکووك لە ململانێی زمانە جیاوازەکان دەرباز بکات. ئومێدمان بە پەندەکانی ڕۆمان هەیە جۆگەلەی ڕووداوە ناخۆشەکان بباتەوە سەر ئاوی ئاسوودەیی. دەکرا کەرکووك چەترێك با، جێی سەری هەموانی بکردبا، کەچی ئێستا چەترێکی شکاوە و کەرکووکییەکان بە تەنیا و بەبێ دڵنەوایی لەبەر بارانی ئاگردا وەستاون و هەیانە و نییانە: خەون (کە لە بەرائەت و نەبەردیی خۆیان، ناوی نانێن وەهم).

ئەو فرەیی دەنگ و ڕەنگەی لە کەرکووکدا هەیە و خۆی لە بوونی تورکمان و عەرەب و کورددا دەبینێتەوە، لە بری ئەوەی خاڵی بەهێزی کەرکووك بێت، بەداخەوە بۆتە خاڵی لاوازی ئەو شارە. ئەم لاوازییەش بۆ هۆکارێکی سادە دەگێڕمەوە کە خۆی لە نەبوونی ڕۆڵی ڕووناکبیری و ڕووناکبیرانی ئەم سێ نەتەوەیە دەبینێتەوە، خەڵکی کەرکووك

تەنیا لە چاوی حزبەکان و سیاسییەکانی نەتەوەکانیانەوە یەکتر دەخوێننەوە، سەیریش لەوەدایە تورکمان و عەرەب و کورد لە یەك گەڕەکدا و لە تەك یەکدا دەژین و لە یەك سەرتاشخانە قژیان چاك دەکەن و لای یەك بەقاڵ پەتاتە دەکڕن و لە هەڵبژاردنەکانیشدا دەنگیان دەچێتە ناو یەك سندووقەوە، کەچی شەوان لە ڕێی ئەو کەناڵە ئاسمانیانەی لە هەولێر و بەغدا و ئەنقەرەوە پەخش دەکرێن یەکتر دەخوێننەوە و یەکتر دەبینن و پێناسەی یەکتر دەکەن! بۆچی کوردەکان لە چاوی گۆرانییەکانی هابەوە تورکمانەکان نابینن؟ بۆچی تورکمانەکان لە چاوی عەلی مەردانەوە کوردەکان نابینن؟ هەموو فیکرێك جا نەتەوەیی بێت یان نێونەتەوەیی، ئەگەر یەکسان نەبێت بە ئازادی و مرۆڤدۆستی، فیکرێکی چەواشەکار و شۆڤینیانەیە. بەداخەوەش ئەو فیکرەی لە کەرکووکدا پیادە دەکرێت ئاوێتەبوونی چەمکەکانی پەیوەست بە حزب و ڕووناکبیرییە، حزب و ڕووناکبیری هەرچەندە لە ڕووکەشدا دەسلەملانێی یەکتربن، بەڵام لە ڕاستیدا پێچەوانەی یەکدی کار دەکەن، حزب دەیەوێت هەموو ڕەنگەکان، هەموو دەنگەکان بینە یەك و هەر خۆیشی ڕابەرایەتی ئەو دەنگ و ڕەنگە بکات، حزب لای خۆمان بە هەر هەنجەت و لەژێر هەر ناونیشانێك چەندە پیرۆز و بە بەهاش بێنە بەرچاو، هەر مەبەستی دروستکردنی ڕەعیەتی هەیە، بەڵام بە مەرجێك لە دەرەنجامدا خۆی شوانی ئەو ڕەعیەتە بێت، بە پێچەوانەی ڕووناکبیری کە دەرەنجامی هەموو کایەکانی ئەوەیە کوتلەی یەك دەنگی و یەك ڕەنگی بشکێنێت و

فرەدەنگی و فرەڕەنگی بێنێتە کایەوە، لە ئەنجامی بەریەککەوتنی ئەو دەنگ و ڕەنگە جیاوازانەش پێشکەوتن و گەشەکردن دروست دەبێت. بوونی کولتووری جیاوازی سێ نەتەوە دەبوایە کەرکووك لە هەموو شارەکانی دیکەی عێراق جوانتر بکات، بوونی ئەدەبیاتی جیاوازی سێ نەتەوە دەبوایە وا لە کەرکووك بکات گرەوی داهێنان و تازەگەری لە هەولێر و سلێمانی بباتەوە، بوونی مۆسیقا و گۆرانیی سێ نەتەوەی جیاواز دەبوایە گوێی کەرکووکییەکان لە چەقبەستوویی نەتەوەیی پاك بکاتەوە، بەڵام کامە ئەدیبی کورد ئاگای لە ئەدەبیاتی تورکمانی و عەرەبیی کەرکووك هەیە؟! کامە ئەدیبی تورکمان یان عەرەب ئاگای لە ئەدەبیاتی کوردی هەیە؟! هەموو تورکمان و عەرەبی کەرکووك لە ڕێی میدیای ڕەسمیی پارتی و یەکێتییەوە سەیری برا کوردە هاوشارییەکانی خۆیان دەکەن! کە ئەو دوو پارتە یەکەم یەکسان نین بە هەموو گەلی کورد، دووەم لایەکی سیاسەتن و لە زۆربەی تەرحەکانیاندا ڕەچاوی لایە ڕووناکبیری و ژیارییەکان ناکەن، لەوبەریشەوە هەموو کوردەکان لە ڕێی جەبهەی تورکمانییەوە سەیری برا تورکمانە هاوشارییەکانی خۆیان دەکەن، جەبهەی تورکمانیش یەکسان نییە بە هەموو گەلی تورکمان و تەرحەکانیشیان سیاسین و پەیوەندی بە لایە ڕووناکبیری و ژیارییەکانەوە نییە، تێکڕای خەڵکی سادەی کەرکووك بە ڕووناکبیرەکانیشەوە هێشتا گرەو لەسەر بوونی هەق دەکەن، ئەم گرەوە ڕۆمانسییەش وای کردووە باوەڕ بەوە نەکەن کە هەولێر و بەغدا و ئەنقەرە بە میدیاکانیشیانەوە هەق بەڕێوەی

نابات، بەڵکو هێز بەڕێوەی دەبات. بەڵێ کەرکووك پێویستی بە هێـزە، بەڵام ئەو هێـزە نـا کە کـوێری و نەبینینـی ئەوی دیـکە بەرهەم دێنێت، بەڵکـو هێـزی ئیـرادەی ئـازادبوون و کـرانەوە بە ڕووی ئـازادی بەرامـبەردا. بـۆچی ئەو پـرییەی کەرکـووك کە پێویستە جێی شانازی بێت، یەکسان بووە بە بەتاڵی و بۆتە مایەی نەنگی و ئاشـووبە؟ بـۆچی دەبێـت دوو دراوسـێ کە چیخێکیـان بەینە، لە ڕێی سەتەلایتەکاتی هەولێر و ئەنقەرەوە یەکتـر بناسـن؟! بیـری نەتەوەیـی کە لەسـەر حسـێبی مرۆڤدۆسـتی و ژیاندۆسـتی بوویێـت لە مێـژووی نزیـك و دووردا تەنیـا مـاڵوێرانی بە دواوە بـووە، بە تـایبەتی بـۆ ئەو ناوچـانەی کە فەرهەنـگ و نەژادی هەمەچەشنەی لەخۆگرتبێت، بیری نەتەوەیی هەنگاوێك لەولاتری بیـری هـۆزگەری و عەشـیرەتگەرییەوەیە، ئەگەر کـوردایەتی یەکسـان نەبێـت بە ئـازادی و کـرانەوە بە ڕووی ئەوی دیـکەدا، هیچ مانایەکی نییە و نەبوونی باشترە. خۆ دەکرێـت ڕوونـاکبیری و ڕوونـاکبیرانی هەر سـێ نەتەوەی کەرکـووك ئەو کەلێـنە پـڕ بـــکەنەوە کە حزبەکـــان و سیاســـییەکان بـــۆ بەرژەوەنـــدیی بەشـوانبوونی خۆیـان بەسـەر خەڵکـی کەرکـووکەوە دروسـتیان کـردووە، خـۆ دەکرێـت سـاڵانە چەنـدین فێسـتیڤاڵی ئەدەبـی و هونەریی هاوبەش لەو سێ نەتەوەیە سـاز بکرێـت و هەمـووان بە خەم و خەونـی شـارەکەیاندا هەڵبلـێن، سـەیرە لە کەرکووکـدا ساڵانی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو لە ڕووی ڕوونـاکبیرییەوە لە ئێستا پێشکەوتووتر بێت، تازەگەری شیعر و ئەدەبیـات و شـانۆ و شـــێوەکاری لە عێراقـــدا لەســـەر دەســـتی کـــورد و عەرەب و

تورکمانەکـانی کەرکـووك هاتەکـایەوە و مێـژووی شـارەکەش شایەتی بۆ سەرگۆن پۆڵس و جەلیل قەیسـی و فـازڵ عەزاوی و لەتیـف هەڵـمەت وبەدیـع باباجـان دەدات. هەمیشـە سـەبەتەیەك میوەی هەمەجۆر جوانترە لە تـاقە میـوەیەك، هەمیشـە تـابلۆیەکی ڕەنگاوڕەنـگ جـوانترە لە ڕەسـمێکی ڕەش و سـپی، دەبێـت ڕوونـاکبیری و ڕوونـاکبیرانی کەرکـووك کـار بـۆ دەرخسـتنی جوانییەکـانی ئەو فـرەییەی کەرکـووك بـکەن و بە حـزب و سیاسـییەکانی کـورد و تورکمـان و عەرەب بڵـێن: کەرکـووك تابلۆیە و ڕەسمی شەمسی نییە.



كيتاب

دوێنێی شوێن.. ئێستا

ئەم ناونیشانەی سەرەوە، کتێبێکی شیعریی ئەدۆنیسە و لە سێ بەرگدا چاپ کراوە، لە نێوان ساڵەکانی (١٩٩٥ تا ٢٠٠١) نووسیویەتی، لە هەر لاپەڕەیەکدا سێ شیعر بە یەکەوە دەڕوات، دەکرێ سەربەخۆ بیانخوێنیتەوە و دەشکرێت بەیەکەوە، چونکە یەك ئەتمۆسفێری شیعرییان هەیە، گەر یادەوەریم خیانەتم لێ نەکات، ساڵی ٢٠٠٢ یەکەم جار ئەو کتێبە شیعرییەم لە لای هاوڕێی ئازیزم دڵشاد عەبدوڵلای شاعیر بینی، گوتی لە قاهیرە بۆم هاتووە و بەرهەمێکی شیعریی نوێی ئەدۆنیسە، کە خوێندمەوە بە دڵم نەبوو، ئەو وێنایەی لەبارەی زمان و ئەدای ئەدۆنیسەوە هەمبوو کەمێك جیاوازتر بوو لەو تێکستە، دواتر وێڕای ئەوەی کتێبەکەم بۆ خۆم دەسکەوت کەچی هەر بەو تێڕوانینەی یەکەمم نەچوومەوە سەری، تا ئەدۆنیس هاتە کوردستان و لە سلێمانی ماوەی هەفتەیەك زیاتر بە یەکەوە بووین، کاتێ باس هاتە سەر ئەو کتێبەی من گوتم بە دڵم نەبووە، چونکە زیاتر پەیوەستە بە مێژووی ئیسلام و کوشتاری ئەمەوی و عەباسییەکان، گوتیشم من لە شیعردا شیعریەتم لا مەبەستە نەك گەورەیی ڕووداو و وەرچەرخانە مێژووییەکان، لەوێدا ئەدۆنیس قسەیەکی ئەوتۆی نەکرد، بەس پێ دەچوو لە بیری مابێ، چونکە ئەو ڕۆژەی لەگەڵ ئەودا چوومە بینای ئەمنە سوورەکەی سلێمانی و ژوور بە ژوور مەرگەساتەکانی دەبینی، داوای لێ کردم نووسینەکانی سەر دیواری زیندانەکانی بۆ تەرجوومە بکەم، کە زۆربەیان بە خوێن نووسرابوون، کاتێ

هەموویم بۆ تەرجوومە کرد ئینجا گوتی پێویستە من و تۆ لەبارەی "کیتاب"ەوە قسە بکەینەوە، گوتی ئەو کتێبەت بۆیە بە دڵ نەبووە چونکە دەرفەتی تەواوت پێ نەداوە، نەتویستووە ئەو وێنەیە درزی تێکەوێت کە لەبارەی شیعریەتەوە هەتە، دەنا ئەو مەرگەسات و خوێن و کوشتارەی کیتاب دەیگێڕێتەوە، لای ئێوە بە ڕوونی پەیڕەو کراوە، ئێوە پێش هەمووان قوربانیی کوشتارگەی بیری تەسکی ئایینی و تایەفی و عروبەن. لەوکاتەوە من چەند جارێك ئەو کتێبە سێ بەرگییەم خوێندۆتەوە، جار دوای جار پەیوەندیم لەگەڵ ئەو تێکستە بەهێزتر دەبێت، خوێنەر تووشی سەرسوڕمان دەبێت ئەو شاعیرە چۆن دەتوانێت لەو ئۆقیانووسەی مێژووی ئیسلامەوە ئەو هەموو کوشتنە پێناسە بکات؟! بە هەزاران سەرچاوەی لەبارەی ڕووداوەکانەوە لەکوێ بوو؟ جوانییەکەیشی لەوەدایە ئەدۆنیس ئەو تێکستە وەك دەستنووسێکی موتەنەبی دەناسێنێت، بەڵام شت و ڕووداوە سەردەمییەکانی بۆ زیاد کردووە، بێگومان گەورەیی موتەنەبی کە ئەدۆنیس پێی وایە لە ماوەی هەزار ساڵدا مرۆڤایەتی یەك شاعیر بەرهەم دێنێت، کە هەزارەی یەکەم هۆمیرۆسە و هەزارەی دووەمیش موتەنەبییە، تێکەڵبوونی موتەنەبی لە گێڕانەوەی ئەو هەموو کوشتارەدا ختووکەی شاعیریتی ئەدۆنیس دەدا تاوەکو شت و ڕووداوەکان لە دەمی گەورەترین شاعیر باس بکرێت کە خۆیشی کوژراوە، ئەو موتەنەبییەی کە ئیمامی شافیعی لەبارەیەوە دەڵێت (ئەگەر بێ ئابڕوو و چەقاوەسوو نەبوایە، ئەوا هەموو زانستی خۆم لەوەوە وەردەگرت).

ئەدۆنیس ڕاستی کرد کاتێ پێی گوتم: (ئەو کتێبەم هەوڵێکە بۆ نووسینەوەی کۆمیدیای خواوەندی موسڵمانان). خوێنەر دەستەوەستان دەبێت لەو هەموو خوێنە بە ناهەق ڕژاوەی ئەم ڕۆژهەڵاتە. لەوانەیشە خوێنەری کورد ناونیشانی کتێبەکەی لا سەیر بێت (دوێنێی شوێن.. ئێستا)، بەڵام لە ڕاستیدا کورتکراوەی تێکڕای دنیابینی ئەدۆنیسە بۆ مێژووی عەرەب و ئیسلام، کە پڕە لە غەدر و پاوانخوازی و دوواکەوتوویی و کوشتار و سووتاندن و سەربڕین و میتافۆڕی ئەشکەنجە و نادادی. ئەدۆنیس لە ڕێی ئەو ناونیشانەوە پێی وایە ڕابردووی ئەم شوێنەی ئێستامان کە خۆرهەڵاتە، لە ڕووی شارستانی و ژیارییەوە هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە، هەمان کوشتارەکەی جاران، هەمان نواندنی هونەری یەکترسڕینەوەیە، دوێنێی شوێنی ئێستامان ڕووبارێکە و جۆگەڵەی تازەی لێ بۆتەوە کە قاعیدە و وەهابیەت و گرووپە توندڕەوە دینییەکانن:

- شار / بیابان: پۆستەی ناوەستێ
نامەکان تەنیا لمیان تێدایە.

- سەیرە هەموو شتێکی جوان لەم شارەدا ساتی لەدایکبوونی دەمرێت

کوشتنیش تیایدا سروودێکە تەنیا لە قوڕگی (با)دا شوێنی دەبێتەوە.

- ئەم شارە جێی هەموو شتێکی لێ دەبێتەوە
تەنیا ئەو ئەندامە بچووکە جوانە نەبێت، کە دڵە.

- سیستەمی ئەم شارە چەند پتەوە، ئاسایشی چەند بەهێزە

پتەوترین و بەهێزترین شت تیایدا، بێوەژن و سەگەکانن
بێوەژنەکان بۆ ڕازاندنەوەی شەقامەکان.
سەگەکانیش بۆ پاسەوانی
- لە هەر کوێ ببینم بە یەقین دەڵێم:
ڕاستە لێوت هەورە، بەڵام سەرت بەردە.
- ئەم شارە بە یەك مەرج شیعری خۆش دەوێ:
کوتکێك بگرێتە دەست و لە شەقامەکان بسووڕێتەوە.



## نووسینی داخراو
## خوێندنەوەی کراوە

(١)

یەکێك لەو هەڵە کوشندە ئەدەبیانەی هەندێك لە نووسەران دەیکەن ئەوەیە کە خوێنەر بە نەزان دەزانن، حسێبی خوێنەری زیرەك ناکەن، لە تێکستەکانیاندا هەڵوێستی خواوەندیان هەیە و هەموو شتێك ڕوون دەکەنەوە، هەموو شتەکان دەڵێن، هیچ پەراوێزێك بۆ خولقاندن و هیچ مەودایەك بۆ خەیاڵی خوێنەر ناهێڵنەوە، ئەمەیش دەبێتە هۆی نەمانی متمانەی خوێنەر بە نووسەرێك، تا ئەو ڕادەیەی تەنیا ناوی ببینێت بابەتەکەی ناخوێنێتەوە، ئەم پەتای نووسەرە خودائاسایانە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو لەگەڵ ڕاپەڕینەوە لەو ڕۆژنامەنووسە حزبیانەوە هات کە هەر زوو دەست و تێکستیان کەشف بوو، لەوانەیە قازانجی ماددی و پۆستیان کردبێت، بەڵام بۆ هەتاهەتایە خوێنەریان دۆڕاند. بە داخەوە لەم چەند ساڵەی دوایی پەتاکە هەندێ لە ئەدیب و نووسەرانیشی گرتۆتەوە. خۆشبەختانە کەمتر لە نەوەی تازەدا بەدی دەکرێت، چونکە دیدێکی ئەدەبی لای هەندێ نووسەری لاودا هەیە کە زۆر دڵخۆشم دەکات (ڕەنگە هەندێکیشی لە نەوەی پێشوو پەست کردبێت) لەوەی خەریکە لەسەر دەستی ئەوان ئەدەب لە بەرەی کۆمەڵگا و نەتەوەوە دێتەوە بەرەی ئینسان.. تەنیا ئینسان. ئەمەش دابڕانێکی جۆرییە لە دید و دنیابینی ئەدەبیاتی مامۆستا شێرکۆ بێکەس و عەبدوڵڵا پەشێو کە لە ماوەی چل ساڵی ڕابردوو ئەدەبیان لە بەرەی کۆمەڵگا و نەتەوەدا بوون (بێگومان کارێك بووە جێگەی ڕێزە)،

بەس کاتی ئەوە هاتووە ئەوەی لەسەر شانی سیاسەت و سیاسییەکانە لێکەوتە باش و خراپەکانی بچێتەوە ئەستۆی سیاسەت و سیاسییەکان، شیعریش بگەڕێتەوە ئەو مێرگەی لە پێناویدا خولقاوە کە بریتییە لە جوانی و ستاتیکا.

(٢)

چ گەمژەیەکە
داوا لە نەوەی نوێ بکا ڕێك بڕوا
لە ڕۆژگارێك خۆی دەشەلێ؟!

(٣)

جاران، نووسەر ڕاستەوخۆ بوایە یان نا، بەشێك بوو لە تەماهیکردن لەگەڵ ڕۆڵی مەلا، لە گوتاردان و هوتاف و چاندنی هەڵوێست و دووورینەوەی چەپڵە و پێزانین (کە ئەمەیش مایەی ڕێزە). ئەوەی دڵخۆشکەرە لە نەوەی نوێ ئەوەیە، بۆتە لایەنگیری شت و توخمە پەراوێزەکان، کتێب بۆ ناسین و ناساندنەوەی نەگبەتی خۆی دەخوێنێتەوە، دوور لەو وەجاهەتە کۆمەڵایەتییەی جاران نووسین و نووسەربوون دەیبەخشی.

(٤)

گەر بۆ ساتێك باوەڕ بەو قسە ڕۆمانسیەی لایەنگرانی سیاسەت بکەین کە مێژوو هەمیشە گەورەتر بووە لە ئەدەب، یان مێژوو ئەدەبیش لەخۆ دەگرێت و بێینەوە سەر خوانی ئەو واقیعەی کە نەك بە کەڵکی خواردن نایە، بەڵکو ئیشتیهای خەونیشت ناهێڵێ، دەبینین ڕاستە قەت ئەدەبیاتی کوردی دەرەقەتی واقیع نەهاتووە، پیرێژنێکی گەرمیانی باسی کارەساتی ئەنفالت بۆ بکا لە هەموو ئەو ئەدەبە گەورەتر و کاریگەرترە لەبارەی ئەنفالەوە نووسراون، ئێ مەرەکەب بەرامبەر خوێن چی لەدەست دێ؟! بەڵام گرفتەکە تەنیا لە گەورەیی کارەسات نییە بەرامبەر بە خەون، بەڵکو لەوەشدایە کە سیاسەت ئەو هەموو کارەساتەی خوڵقاندووە، حیکمەت و کەرامەتی نالی زۆر گەورەترە لە دنیابینی حاکمەکانی بابان، تەقەتەقی چاپخانەکەی حاجی تۆفیقی پیرەمێرد کاریگەرتر بووە لەو شەوە زیکر و تەراویحانەی شێخ مەحموود بە کوردەکانی دەکرد. ئەوە ئەحمەدی خانییە یەکەم دۆکی ۆمێنتی بیری نەتەوەیی تۆمار دەکات. ئەوە حاجی قادرە باسی گرنگی صەحافە و سەقافە دەکات لەو کاتەی سەرۆك عەشیرەتەکان و ئەو مەلایانەی بازرگانییان بە خەڵکی خوا دەکرد، دیوەخانانەیان لە سوڵتانی ئەعزەمی عوسمانلی بۆ برابۆوە. دوای ڕاپەڕینیش دەسەڵاتی کوردی حسێبی پووشێکی بۆ خەونەکانی ئەدەب و ئەدیبان نەکردووە، نەك ئەوەندە، بەڵکو لە هەموو حاڵەتێکدا ئەو

خەونـانەی بە وەهـم زانیـوە. ئـێ دەبـێ شۆڕشـی چەکـداری چ پێویستیەکی بە خەون هەبێت؟!

(٥)

هەنـدێ لەو گەنجـانەی دەیانـدوێنم ئومێـدیان بە ئاشـتبوونەوە نەماوە لەگەڵ دنیا، لەگەڵ مێژوو، لەگەڵ نیشتیمان:

من نازانم کاری کێیە

- هەنگوین و خوێ

- گەنج و ڕۆژگار ئاشت کـاتەوە و متمانەیـان بەوە بێـت کە ڕووناکی ئێستایانە و خۆڵەمێش ئاییندەی هەموو شتەکان نییە.

(١)

ئايا ئەدیب و هونەرمەندی گەورە لە شاری بچووك پەیدا دەبن؟ لەوانەیە ئەم پرسیارە وەك ژوورێك بێت چەندین دەرگای هەبێت، لە هەر دەرگایەكدا وەلام بدەیتەوە دەرگاكانی ترت پێشێل كردووە، ئەمە وێرای پەنجەرەكانی. ئایا ئەزموون و بەریەككەوتنی نووسەر بە شارێكی یەك زمان و یەك فەرهەنگ و یەك كولتوور دەبێتە مایەی دەستەبەركردنی ئەو فۆرم و تەكنیك و میكانیزمانەی داهێنانی گەورەی ئەدەبی و هونەری لێ بكەوێتەوە؟ هەموومان كۆكین لەوەی ئێمە تا ڕادەیەكی باش مۆدێرنێتەی ماددیمان هەیە،، مۆل و پرد و ئۆتۆمبێلی دوا مۆدێل و هتد.. بەلام مۆدێرنێتەی فكریمان نییە، بەردەوام كۆمەلناسەكان باس لەوە دەكەن ولات وەكو مرۆڤ وایە گەر ئەندامێكی لەكار بكەوێت و نەیگۆڕیت ئەوا ئەندامەكانی تریشی تووشی سستی و وەستان دەبێت، دەزگاكانی ئێرە بە دەسەلاتەكانی یەكەم و دووەم و سێیەم و چوارەمیش، خۆیان دان بە سستی و وەستانی خۆیانەوە دەنێن و پێویستی بە بەلگە و بوختان نییە، لەناو ئەو كۆمەلگایەدا ئەدەبیات چی پێ دەكرێت جگە لەوەی ببێتە پاراسیتۆل؟! تەنانەت ئەو بیانووانەی دەزگا نەخۆشەكان دەیهێننەوە بۆ سستی و وەستانیان، هێندە كۆنە بە كەلكی ڕۆمان و فیلمیش نایەن، لەم چەشنە كۆمەلگایانەدا تاوانەكانیش بە شێوەیەكی سەرەتایی ئەنجام دەدرێن، گەر وا نەبووایە دەبوایە ئێستا ئێمە باشترین و ناوازەترین ئەدەبیاتی پۆلیسیمان هەبوایە.

(٢)

ماوەیەکی زۆر پرسیاری ئەوە دەکرا بۆچی ڕۆژنامە حزبیەکان پێش ناکەون؟ ئەوانەی لەو ڕۆژنامانە کاریان دەکرد کۆمەڵێك وەڵامی هەمەجۆریان دەدایەوە، یەکێك لەو وەڵامانە کە من لێرەدا مەبەستمە ئەوە بوو کە (نازی خەبات)ی ئەو هەڤاڵانەیان کە ماوەیەك پێشمەرگایەتیان کردووە، لێ ناگەڕێ ڕۆژنامە حزبیەکان بەرە و پانتایی و ئاقاری دیکەدا بڕۆن، ئەو نازی خەباتە لە ئێستادا بواری ئەدەبیشی گرتۆتەوە، هەندێك لەوانەی ماوەیەکی زۆرە دەنووسن نایانەوێت دان بەو ڕاستییە تاڵەدا بنێن کە سەردەمەکە تێپەڕاندوون، نازی خەباتی ئەدەبی دەکەن، ڕاست و چەپی نەوەی نوێ ڕەت دەکەنەوە. بە داخەوە لە زۆر کاتیشدا خاوەنەکانی نازی خەبات و خاوەنەکانی نازی نووسین یەك دەگرنەوە و لە سەندیکا و ڕێکخراوە هونەری و ئەدەبیەکاندا پلەوپایە دەبەخشنەوە، وەرگێڕانی ئەو سەرمایە مەعنەویەی نازی خەبات و نازی نووسین بۆ دەسکەوت و پلەوپایە کارێکە مێژوو بەزەیی پێدا نایەتەوە.

(٣)

له زۆر شـــوێندا، له زۆر بـــۆنەدا، بە تـــایبەتی لە گفتوگـــۆ ئەدەبیەکانـدا، لە دەیەهـا نووسـەرم خوێنـدۆتەوە کە تکـا دەکەن کتێبەکانیـان، تێکستەکانیان ببـنە بـابەتی قسـەوباس، نەك لێـدوانە ڕۆژنامەوانی و ژیانی شەخسییان، لێرەدا چەنـد نمـوونەیەکی کەم دەهێنمەوە (چونکە لای هەمووومان نموونەکان زۆرن): مـارکیز بە هۆی هـاوڕێیەتی لەگەڵ فیـدل کاسـترۆ و عـومەر تۆریخـۆس و چەند سەرکردەیەکی دیکەی ئەمریکای لاتین، هەمیشـە تووشـی پرسـیار و لێـدوانی نەشـیاو دەبـۆوە، وێـڕای ئەوەی بەرگـری لەو دۆستایەتییە دەکرد، بەردەوام داوای دەکرد کە ڕۆمانەکـانی ببـنە جێـی قسـەوباس، ئەو لە ڕۆمانەکانیـدا بـوونی خـۆی پێناسـە کـردووە، ئۆرهـان پـامۆك چەنـدان جـار داوا لەو کەسـانە دەکـا دیالۆگی لەگەڵ دەکەن باسـی (بەفـر) و (نـاوم سـوورەیە) بـکەن نەك قسـەکانی لەبـارەی جانتـای بـاوکییەوە، ئەدۆنـیس هەمیشـە دەیەوێـت باسـی شـیعر بکـات نەك پەیوەنـدی و هەڵوێسـتی لە ڕژێمە عەرەبییەکانەوە..

لای ئێمە بە پێچەوانەوە، بەشێك لە ئەدیب و هونەرمەنـدەکان هێنـدەی ژیـانی شەخسـی و ژنهێنـان و تەڵاقـدان و هەڵوێسـتیان لەبـــارەی دەســـتوور و خۆکاندیـــدکردنیان بـــۆ پەرلەمـــان و پەیوەنـدیەکانیان بەم و بەوەوە بـۆتە پێناسـە و باسـوخواس، قەت نووسینیان، فکریـان، نوێگەریـان بـوونی نەبـووە، ئەوان هێنـدەی لەناو زاکیرەی کۆمەڵایەتی (هەمـوو جـاریش بە فەزیـحەیەکەوە)

بوونیان هەیە، ئەوەندە لەناو تێکستدا نین. قسە دەکات، لێدوان دەدات، لەبارەی هەموو شتێکەوە دەدوێت تێکست نەبێت. بۆ ئەدیب گرنگە تێکستی هەرا بنێتەوە نەك فەزیحە شەخسییە بچووکەکانی، بۆ هونەرمەند گرنگە گۆرانییەکەی بەرامبەر بە کۆن و باو نوێگەر بێت نەك جیابوونەوە لە ژنەکەی، سەیر لەوەدایە هەندێ لە ئەدیب و هونەرمەندانی ئێمە لە تێکست و بەرهەمیاندا تا سەر ئێسقان تەقلیدی و کۆنەپەرستن، بەس دەیەوێت لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا لاسایی ئەو وێنانە بکاتەوە کە لە وێنەگرە پەپەرازییەکانەوە دەیبینێت {پەپەرازی: ئەو وێنەگرانەی بە دوای کەسایەتییە بەناوبانگەکانەوەن بۆ گرتنی وێنەی ئابڕووبەرانەیان}.

هەر نووسەرێکی باشی دنیا دەگریت: لە ژیاندا ڕاستگۆ و ڕەفتار جوان بووە، لە تێکستدا تێکدەر و بەڕەڵایە، بەس لای ئێمە هەندێکیان لە ژیاندا بەڕەڵایە و لە تێکستیشدا بۆینباخی بەستووە و بە زمانی کۆن و بە فۆرمی کۆن و بە فکری کۆن وەك شەستەکانی سەدەی ڕابردوو بیر دەکاتەوە و دەنووسێت.




## پەیکەرتاشی بێدەنگی

(١)

ئەگەر هەر کەسێك، لە هەر شوێنێك، مۆزەخانە بێت یان نا: بەرەیەك، بەردێك، گۆزەیەك، گوارەیەك ببینێت تەمەنی چەند هەزار ساڵێك بێت، ناکرێ ڕێزی نەگرێت و بە چاوی خۆشەویستییەوە سەیری نەکا، خۆ مرۆڤایەتی نەك ڕێزی توحفەی بەجێماوی پاشا و شازادە کۆنەکانی گرتووە و بە جوانترین دیزاین لە مۆزەخانەکاندا نمایشیان دەکا، بەڵکو پارچە تەنەکەیەك کە کراوەتە دەفر، یان ئاسنێکی ڕزیو کە کراوەتە قەڵەمبڕ، خراوەتە ناو شووشەی گرانبەها و ناوازەوە. باشە گەر بەردەکەی حەمۆڕابی تەمەنی سی و حەوت سەدە بێت، گەر تابووتەکەی ئاموون تەمەنی پەنجا سەدە بێت و بەمشێوەیە ڕێزی لێ بگیرێت، ئێ خۆ تەمەنی گۆی زەوی نزیکەی چواردە ملیار ساڵە، خۆ ئەم هەسارەیەی ئێمەیش توحفەیە، ئێمە بە مانای وشە لەسەر توحفەیەکی بەردەوامدا دەژین، هەناسە دەدەین و فێر دەبین، یەکتر دەناسین و نەوە دەخەینەوە، بە پێستی جیاواز و جلی جیاواز و زمانی جیاواز دەگوزەرێین و هەرای جوانیی فرەیی کولتوور و فەرهەنگ دەنێینەوە. ئەی بۆچی ڕێزی ئەم توحفەیە ناگرین کە لە سەریدا تەمەنێکی کورت و بێ وەلام بە ڕێ دەکەین، ئەم توحفەی زەوییەمان بەسەر نەژاد و نەتەوە و تایەفە و مەزهەبدا دابەش کرد، ئەو هەموو سنوورە و هەر سنوورێك سوپایەك بەرگری لێ دەکا، ئەو هەموو خوایە و هیچیشیان بەیەکەوە هەڵناکەن، ئەو هەموو بانگەوازی هەقە و هەموو

هەقەکانیش غەدریان لێ بەردەبێتەوە، ئەو هەموو سەرۆك و کۆمپانیا و سەرمایەی بێجگە لە مرۆڤ و بوونەوەر و زیندەوەرانی سەر ئەم توحفەیە، هەناوی زەویشیان هەڵکۆڵی و نەوت و گاز و کانزاکانیشیان دەرهێنا و ئاسمانیشیان تووشی گرفت کرد، پەردەی حەوت تەبەقەی ئاسمانیان کون کرد و دەرگایان بە ڕووی ئەو تیشکە زیانبەخشانەدا کردەوە کە ملیارەها ساڵە ئەم توحفەیە خۆی لێ دەپارێزێ و بەرگری دەکا. ئەم توحفەیە ملیارەها ساڵ بە دەستی دەیناسوور و فیل و ورچ و نەهەنگ و شێرەوە بوو هیچی بەسەر نەهات، سەدە و نیوێك کەمێك زیاترە بە دەستی ئێمەوەیە، وێرانمان کرد. بە دەستی ئێمە، تۆفان و کۆچ و برسێتی بوونەتە ئەدرێسی ئەم توحفەیە، تەنانەت چارەنووسی ئەو پارچە ئاسنەیشی پێ ڕەوا نابینرێت کە خراوەتە ناو شووشەوە، نا: زەوی خراوەتە ناو ئاگری بکوژ و لاقەکەر و بەرژەوەندییەکانەوە، خراوەتە ناو ئاتوونی درۆی کۆن و تازەوە. بۆ من تاکە هیوای دەربازبوونی ئەم توحفەیە: ئەدەب و هونەرە، هەرچەندە دوودڵم لەوەی ئەدەب لە چیرۆکە ڕاستەقینەکانی بەدبەختیی مرۆڤ بباتەوە، کەواتە تەنیا هونەر ماوە کە بتوانێت ئەو هەموو هاوار و ناهەقییە بۆ نەوەکانی داهاتوو بکاتە لایلایە.

(٢)

لە مۆزەخانەکـــان، ئەوەی کوردبوونـــت بیـــردەهێنێتەوە، دەروازەکەی عەشتار و سەرە جوانەکەی نیفەرتیتی و گـوارە و پاوانە بەجێماوەکانی ئەسکەندەری مەقدۆنی نییە لە بەرلین.

کورسییە ڕەشە ژێر ئیمزاکراوەکانی براوەی خەڵاتی نۆبل نییە لە ستۆکهۆڵم.

دەفـری خـوانی نـاپلیۆن و تیـروکەوانەکەی هەرقەل و گـۆزە شەڕابەکەی ژێربالی باخۆسی خوای بادە و تابلۆی دووایین نـانی ئێوارەی دیلاکروا نییە لە پاریس.

ئەوەی کوردبوونـت بیـردەهێنێتەوە: ســەردابێکی نـووتەك و شێدارە لە ماڵەکەی ڕەزا شا و

خەنجەرێکی ژەنگاوییە لە سوڵتان ئەحمەد و

سەری براوی حوسەینە لە کەربەلا.

(٣)

ئەو هەموو قولابەمان هەڵدایە ئاوی ماناوە

بێجگە لە پارچە تەختە کەشتی نقومبووی خەبات و

پیکی زۆرنا و خۆری کەوتووی سەر بەیداخ و

تەنەکەی ئەمارەتەکان و ئەنگوستیلەی بووکی ئازادی قانع

کە ئێستا بێوەژنە، هیچمان نەگرت.

کەچی بە شەروالی تەڕەوە گلەیی لە شیعر دەکەن:

لەژێر سێبەری داری مەجاز ڕاکشاوە؟

(٤)

بێزار نەبووی لە هەڵخستنی نووزانەوە، بەسەر تەنافی سۆزدا؟!
گوێت لە هاڕەی ئەبجەدیەت نییە لەژێر باری بیرۆکەدا؟!
ئیتر کاتی هاتووە، ببیت: بە پەیکەرتاشی بێدەنگی.



## پێڕە کەشفەکانی ئەدەب

ڕەنگە یەکێك لە نەهامەترین نەهامەتییەکانی یاریکەری وەرەق ئەوە بێت کە کاغەزەکانی دەستی بۆ بەرامبەرەکەی کەشف بێت. ئەم هاوکێشەیە بە مانایەك لە ماناکان بۆ شاعیریش دەشێت، ئەو کاتەی خوێنەر هەست دەکات دەستی هاوکێشە شیعرییەکانی شاعیر زانراو و ناسراوە، بەمەش ئەو سەرسوڕمان و تەزووە جەمالییە نامێنێ کە خوێنەر لە شاعیری داوایە. هیچ شتێك لە شیعردا مەحرەم نییە، پێم وایە شیعر گلۆپ نییە بە هێزی کارەبای کەمتر یان زیاتر لە پێویست بسووتێت، یان شیعر لاستیکێك بێت بە ڕاکێشانی زیاد بپچڕێت. لایەنگیری پەنجەرەیەکی تایبەتی شیعریش نیم، چونکە شیعر وەکو ژوورێك وایە بێشومار پەنجەرەی هەبێت، لە هەر پەنجەرەیەك لێی بڕوانی ئەوا پەنجەرەکانی دیکەت پێشێل و فەرامۆش کردووە وێڕای دەرگاکەی. لەگەڵ ئەمانەشدا شاعیرانی نوێ کۆمەڵێك گرفتی جەوهەرییان لە نووسینی شیعردا هەیە کە ناکرێت بە هەنجەتی فراوانیی دنیای شیعر، گەر زۆر بە کورتیش بێت دەسنیشان نەکرێن:

- لە کۆندا شیعری کوردی هەموو شتێکی لێ بار دەکرا، لە ئەنجامی نەبوونی میتۆدە زانستییەکانی (کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی و سیاسی و ئابووری و هتد..)

شیعر کرابوو بە مینبەری دەربڕاندنی هەموو گرفتەکانی ژیانی کوردەواری، ئەمەش هەمووی لەسەر حسێبی شیعرییەت و شیعربوون. ئەم گرفتە لە حاجی قادرەوە بە ڕاشکاوی دەستی پێ

کرد و پەرپەوە ناو جەستە و پێناسەی شیعری نوێی کوردی، بە تایبەتی دوای جەنگی جیهانی دووەم، ئەو کاتەی بیری نەتەوەیی لەلای تورك و عەرەب بووە پێناسەی ژیان، کوردیش لەرێی شاعیرانییەوە سەرقاڵی ئەو بوارە بوو.

- گرەو کردن لەسەر بابەت و کەمتر ئاوڕدانەوە لە لە لایەنە تەکنیکی و هونەرییەکان سیمایەکی دیاری شیعری کوردی بووە، شاعیرانێك بە ئومێدی بەرهەمهێنانی دەقی مەزن، گرەویان لەسەر مەزنیی بابەت کردووە.
- تێگەیشتن لە زمانی شیعر کۆڵەگەیەکی سەرەکی بە شاعیربوونە، جیاوازیی زمانی شیعر لە گەڵ (قسە و خودی زمان) لە سادەترین پێناسەیدا بریتییە لە:

١. لە خودی خامی زماندا (بەرد تەنیا بە واتای بەرد دێت) مەودای لێکدانەوەی دیکەی نییە، هەموو دالێك یەك مەدلوول هەڵدەگرێت، فرەڕەهەندی بۆ نییە.

٢. قسەکردن وەك مامەڵەیەکی فەردییە لە ناو خامی زماندا، ئازادانە مامەڵە بە کەرەسەکانی زمان دەکەیت، بەڵام لە سنووری ئەو بەکارهێنانەی کە کۆمەڵ لەسەری ڕێك کەوتووە.

لێرەدا گرنگیی زمانی شیعری ڕوون دەبێتەوە، گەر لە خامی زماندا هەر دالێك یەك مەدلوولی هەبێت، ئەوا شیعر بە قەدەر ژمارەی خوێنەر لێکدانەوەی هەیە، هەر دەستەواژەیەك لە شیعردا خوێندنەوەی جیاواز و لێکدژی هەیە. هەروەها گەر قسەکردن مامەڵەیەکی ئازادانەش بێت لە بەکارهێنانی زماندا وەکو گوتمان بەستراوەتەوە بە ڕێکەوتنی کۆمەڵایەتی لە ئەداکردنی و وەکو

شیعر ئازاد نییە، بۆ نموونە ناتوانرێت لە قسەکردندا بگوترێت (بەردم فڕ کرد) یان (هەڵمم کرۆشت)، بەڵام ئەمانە لە شیعردا شیاون، ئەم خەسڵەتە گرنگەی شیعر کە بریتییە لە ئازادیی نیمچە ڕەهای زمان، لە جیاتی ئەوەی نیعمەتێکی گەورەی شیعر بێت ئەوا لە چل ساڵی ڕابردووی شیعری کوردی زۆر جار بەڵایەکی گەورە بووە، لە حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو، لە شیعری کوردیدا جەنجاڵیی بێمانای زمان، ماسکێکی نوێخوازی بوو، ئەوسا ڕۆژانە ئەم دێڕانەت بەرچاو دەکەوت:

(تۆ تاڵی پرشنگی ئەستێرەی شەوگاری ئاسمانی دڵمی)

بەو واتایەی: دڵم ئاسمانە، ئەو ئاسمانە شەوگاری هەیە، ئەو شەوگارە ئەستێرەی تێدایە، ئەو ئەستێرەیە پرشنگی هەیە، ئەو پرشنگە تاڵی هەیە، ئا ئەو تاڵە تۆیت! (وە هەلوممە جەڕڕەن).

ئەو بەڵای بەکارهێنانی بێ جەدوای زمانە تاوەکو ئێستاش بەردەوامە، بەڵکو بە خراپتریش! هەندێك لە شاعیرانی ئێستا کە ناتوانن دراوسێیەتی جوانی نێوان وشە و وشە بەرهەم بێنن، کە ناتوانن مانای شتەکان لە وشەدا بەتاڵ بکەنەوە و پڕی بکەن لە واتای تازە، کە ناتوانن سیاقێکی نوێ ببەخشنە پەیوەندیی نێوان شتەکان، دێن: خۆرنشین دەکەن بە (غروب)! خۆرهەڵات دەکەن بە (شروق)! داستان دەکەن بە (مەلحەمە)! سپێدە دەکەن بە (فەجر) و هتد... زۆرێك لە شاعیران کاتێك لە فەشەلیان بەرامبەر بە جەماوەری شیعر و خوێنەری شیعر دەپرسیت، یان دەڵێن بۆ خۆمان دەنووسین یان پێیان وایە خەڵك لەو ئاستە نین کە لە داهێنانەکانیان بگەن! ڕاستە لە ئێستادا دوورکەوتنەوەی خوێنەر بۆ

شیعر بەشێکی بۆ جەنجاڵی ژیانی سیاسی و بوونی تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو دەگەڕێتەوە بەڵام بەشی شێری بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە مێژووی شیعری کوردیدا هیچ کاتێك هێندەی ئێستا شاعیران بێڕێزییان بەرامبەر بە خوێنەر نەنواندووە: بەوەی متمانەی ئیبداعییان لای خوێنەر نزم بووە، خوێنەر چەند جارێك فرسەت دەبەخشێتە شاعیر، گەر دنیابینییەکی تازەی دەسنەکەوت ئەوا جارانی دواتر تەنیا ناوەکەی دەخوێنێتەوە. شاعیران لەبری ئەوەی لە گەڕەکە زمانەوانییە باوەکان بار بکەن و کۆڵانی تازەی لێکدژییەکان بۆ خوێنەر بدۆزنەوە، هەمان هاوکێشە شیعرییە کۆنەکانی پێ دەفرۆشێتەوە، ئەو دوالیزمییانە دووبارە دەکەنەوە کە لای خوێنەر زانراوە، خوێنەر دەزانێت ئەگەر لە دێڕێکدا ناوی گوڵەگەنم بێت، ئەوا لە دێڕی دووەمدا بە ئەکیدی داس و شمشێری تێدایە! لە دێڕی یەکەمدا (ئاوی تینوو) هەبێت، ئەوا حەتمەن لە دێڕی دواتردا (نانی برسی) هەیە.

(١)

ئێرە دیوارە
لە سێبەریدا
ئەوەی درز نەبێت ناحەوێتەوە.

(٢)

ئەو هەموو نێرینەیە، ئەو هەموو تاریکییە
ئەو هەموو دوژمنە
لە سایەیانەوە بووکی ئازادیی قانع، بێوەژنە.

(٣)

گەر ئاورێك لە مێژووی سەد ساڵی ڕابردووی خۆمان بدەینەوە، ڕێگایەکی ڕووناك نابینیت، تەنیا هەندێ مۆم نەبێت کە بە کەساسی لەمبەر و لەوبەر دەدرەوشێنەوە، ئەو مۆمانە کۆمەڵێك شاعیر و زمانزان و نووسەرن: نالی، حاجی قادری کۆیی، تۆفیق وەهبی، حاجی تۆفیقی پیرەمێرد، قانع، هتد.. لەو هەموو مۆمە بە دەگمەن کەسایەتیی سیاسییان تێدایە. گوتم سیاسی نەك کوردپەروەر، چونکە ئەو ناو و کەسایەتییە ناوازانە ڕابەر و لیدەری کوردایەتی بوون، کاتێ کوردایەتی لای ئەوان بوو، زۆر پاکتر و دڵسۆزانەتر بوو لەوەی دوای شەستەکانی سەدەی ڕابردوو هاتە لای سیاسییەکان. لە مێژووی نوێی کورددا ئەدیبان و نووسەران هاندەر و هەوێنی بزووتنەوە سیاسییەکان بوون،

بەڵام سیاسەتکردن هێندەی ئەدەب یاخی و نـوێگەر نەبـووە، بەو بەڵگەیەی هەموو بزووتنەوە سیاسییەکان وەك ئەوەی ماسـت بـن: کەوچکێك هەوێنیان لە بیری کـۆن و دیـدگای کـۆنەوە هێنـاوە. لێرەدا ئەوەی مەبەستمە ئەمەیە: ئەو حزب و بـزووتنەوە سیاسـییانە چۆن لە خۆیان قبووڵ دەکەن (یان چۆن لێیان قبووڵ دەکرێـت) لەژێر سـێبەری ئەوانـدا (کە قەرزاری دنیـا و قیـامەتی شـاعیرانن) ڕێگە بدەن سـەلەفییەکان تەکفیـری دڵـدار و قـانع بـکەن؟! بە چ بیانوویێك ڕێـگە بە مەلایەکـی تورکمـانی کـوردینەزان دەدەن لە ڕێی لێژنەی ئەوقافی پەرلەمـانەوە دیـوانێکی قوبـادی جەلیـزادەی شـاعیر لە بـازاڕدا کـۆ بکـرێتەوە؟! هـیچ هەنجەتێـك هەیە دێـڕی شیعری شاعیرێکی جـوانەمەرگی وەکـو دڵـدار ئەتـك بکرێـت و کۆمەڵێك قەزەمی سعوودی دەست و قاچی بیـڕنەوە؟! لە هەمـوو مێـژووی ئـێمەدا یەکێـك لە شـەرەفمەندترین و دڵسـۆزترین کەسایەتیمان قـانعی شـاعیرە، کە سـەری بەرزی بـۆ کەس نەوی نەکردووە، کەچی کەسـێکی دواکەوتـووی سـەلەفی کە هەمـوو گیـان و فکـری تـاریکە بـێجگە لە ڕیشـی کە بە ڕۆنـی قەتەری دەبریسـکێتەوە بێـت و تەکفیـری قـانع بکـات؟! ئەو حـزب و سیاسییانە کە ئێستا و ئاییندەیان تاریك کردووە، بە ڕەوای نـابینن لە ڕابردوومـاندا ڕووناکی هەبێت؟!

(٤)

کۆمەڵگای ئیسلامی کۆمەڵێکی یەکڕەنگ و بێ پرسیارە، ئەوەندەی ململانێی سەپاندنی وەڵامەکانی دەکات، گومان بەرهەم ناهێنێت، شیعری ئیسلامی لە باشترین حاڵەتدا بریتییە لە بێنرخکردنی ئینسان بەرامبەر بە وەڵامەکانی ئایین، تیایدا مرۆڤ دەبێتە کۆیلەیەکی گوناهکار و دەپاڕێتەوە! لە کاتێکدا شیعر خۆی خالقی دنیابینیی نوێ و گەڕانی مرۆڤە بە شوێن نادیار و نوێبوونەوەدا، شیعری ئیسلامی دەبێتە کولانەیەك بۆ خۆشاردنەوە لەو گومانانەی کە ئایین ڕێگەیان پێ نادات. شیعری ئیسلامی کار بۆ نەهێشتنی جیاوازییەکان دەکات و دەیەوێت هەموو کۆمەڵ بخاتە ناو یەك کایەی دنیابینییەوە و ئەو دنیابینییەش بخاتە ژێر ڕکێفی وەڵامەکانی ئایین! لە کاتێکدا شیعری کوردی هەردەم ویستویەتی کۆمەڵی یەك کایەی دواکەوتووانە پارچە پارچە بکات و لە دروستکردنی بەریەککەوتنی بەردە ئەستێی جیاوازییەکان ئاگری نوێبوونەوە و تازەگەری بکەوێتەوە، لە مێژووی کورددا هێندەی شیعر کاری نوێکردنەوەی ڕووناکبیری کردووە هیچ ژانرێکی ئەدەبی و هونەری نەیکردووە. یەکەم دۆکیۆمێنتی بیری نەتەوەیی لای کورد، مەم و زینی ئەحمەدی خانییە (کە شیعرە)، یەکەم سۆسیۆلۆژیست کە داوای ئازادی ئافرەت و هێنانەدی یەکسانی کردبێت، فایەق بێکەسە (ئەمیش هەر بە شیعر)، ڕەنگە بگوترێت بێکەس سەروبەندی لەگەڵ ئاییندا نەبووە؟ خۆ حاجی قادری کۆیی مەلا و دیناسێکی

گەورە بووە، کەچی هەرگیز پشتی لە زمان و نەتەوەکەی نەکردووە، حاجی لە شیعرێکدا دەڵێت:

**دەتەوێ پێت بڵێم چییە کوردی**
**عاقڵی و چاپووکی و جوانمەردی**
**میللەتێکە لە فەوقی تورك و عەجەم**
**صاحیبی حەزم و ڕەزم و بەزم و کەرەم**

هەرچەندە من پێم وانییە کورد لە هیچ میللەتێکی دیکەی دنیا مەزنتر بێت، بەڵام لێرەدا حاجی مەبەستی ئەوەیە کە لە هیچ میللەتێکی دیکەی دنیاش کەمتر نییە.




## کــــامـــۆ..

## ویژدانە زیندووەکەی سەدەی بیستەم

بوونی کامۆ لە کتێبخانەی کوردیدا کە نزیکە لە نرخ نایەت، بە تایبەتی کە کتێبەکانی ئەو فەیلەسووف و ڕۆمانووس و شانۆکارە بۆ زیاتر لە چل و پێنج زمانی زیندووی دنیا وەرگێردراون.

لە ڕاستیدا قسەکردن لەبارەی کامۆ زۆر لە قسەکردن لە میوە دەچێت: وەسفی تامەکەی ناکرێت و دەبێت تەنیا لە کاتی خواردنیدا هەستی پێ بکەیت. کامۆیش چەقی بیرکردنەوەی هێندە دژوارە و بەرهەمەکانی هێندە ئاڵۆزە لە مانا و دەرکەوتەکانی، لە پەلهاویشتەکانی بۆ ئینسان و ژیان کە ئەستەمە بتوانرێت خاڵێکی مەرکەزی بۆ فکر و داهێنانەکانی دەستنیشان بکەیت.

نەوەی من (نەوەی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو قەرزاری کامۆن) لەوەی ئەدیب و نووسەر لەسەریانە دژی توندوتیژی بوەستنەوە، لەوەی شتێك نییە پێی بگوترێت جەنگی پیرۆز، هەر بە نموونە: کامۆ بە قەد دژایەتیکردنی بۆ داپلۆسینەکانی حکوومەتی فەرەنسی دژی کارە توندوتیژیەکانی شۆڕشگێڕەکانی شۆڕشی جەزائیر بوو. کەس کامۆ نەخوێنێتەوە، دەبێت کورد بیخوێنێتەوە، چونکە ئێمە نەتەوەیەکین قوربانیی جەنگین، بەناوی جەنگ و پاڵەوانەکانی جەنگەوە، چەندین ئینسانی شەڕانگێزمان وەك پاڵەوان قبووڵ کردووە، چەندین ناهەقیمان چەشتووە، چ نەوەی من و چ نەوەی پێشە من و چ نەوەی ئێستایش کەمجار هەبووە هەست بەبێ ئینتمایی نەکات بۆ ئەو شەڕە پیرۆزانەی بەناوی جیاجیاوە ئەنجام دراون. بیرمە لە سەردەمی شەڕی ناوخۆدا هەردەم (بێگانە)کەی کامۆ لەبەردەستم

بـــووه، له شــێوەی پـــاڵەوانەکەی ڕۆمـــانی (دۆزەخ)ی هەنـــری باربۆس، منیش هەر دەمپرسی و دەمپرسییەوە: (ئـای.. هەقـیقەت: دەبێ مەبەستیان چی بێت لەم قسـەیە؟). له شێوەی پاڵەوانەکەی بێگانە، مێرسۆی هاوڕێمان گەر دایکمان بمردایە دەبـووایە بلێـین (بـبـوورە گەورەم وەك دەزانـــی هەڵەی مـــن نیـیه). ئایـا دەبێـت بەسوودتر و کاریگەرتر و ڕوونتر لەو قسـەیەی کـامۆ چـی بێـت کە دەیگـوت: (ئـێمە خەریـکە دەخنکێـین لەنـاو ئەو ئینسـانانەی پێیان وایە بەس خۆیان لەسەر هەقن!).

ڕاستە باسکردن و نووسین لەبـارەی شـەڕەوە سیمای دیـاری سەدەی بیستەمی ئەدەب بووە (ئالیۆت و هیمنگوای و فـۆکنەر و عەزرا پاوەند و نیرۆدا و کازانتزاکیس و مارکیز و چەندانی تر)، بەڵام کامۆ هەردەم گشتگیر و خـاوەن دنیـابینی سـەربەخۆ بـووە، هەر بۆ نموونە (شانۆگەری کالیگۆلا دەکرێـت وەك سـەرچاوەی هەمـوو ئەو ڕۆمانـانە سـەیر بکرێـت کە دواتـر لەبـارەی سـتەمی دەسـەڵاتدارانەوە نووسـراون: ئـاهەنگی تەگەی مـاریۆ فارگـاس یۆسا، سەرۆکی هێژای ئەسـتوریاس، پـایزی پەتریـارکی گابرێـل گارسیا مارکیز و هتد..).

ئەو تانەوتەشـــەرانەی لەلایەن مارکســـییەکانەوە ئاراســـتەی فەلسەفە و دنیابینی کامو دەکـرا (لەوەی فەلسـەفەی وجـوودیەت مانـای بەرەڵایـی دەگەیەنێـت) زۆر لەو تانەوتەشـەرانەی ئێسـتای ئیسـلامییەکان دەچێـت کە ئاراسـتەی عەلمـانیەت/ سـکۆلاریزم دەکـرێن، لەگەڵ ئەو هەمـوو دژایەتـیەیش (ئـاخر ئەسـتەمە لە پەنجاکـانی ســەدەی ڕابــردوو مارکســی نەبووایــت و وەك مرۆڤدۆستیش سەیر بکرێیت). کامۆ توانی پەیامەکەی بگەیەنێت

که ئایدۆلۆژیای گشتگیر و موتڵەق مرۆڤی کوێر بەرهەم دێنێت.
کامۆ دژی گوتاری باو بوو، ڕەتی کردەوە مارکسییەت بە پیرۆز بزانێت و پشتگیری لە سیستەمی تۆتۆلیتاری شیوعیەکان بکات (وەك چۆن زۆربەی زۆری ڕۆشنبیرانی ئەوسا کردیان: جان پۆل سارتەر بە نموونە) دژایەتی کرا و تەنانەت پێشی دەگوترا (خانەنشینەکەی خەباتی مرۆڤایەتی)، وێڕای ئەن تۆمەتە ناڕەوایە، کامۆ لە هەمووان زیاتر لەناو جەرگەی ڕووداوە بچووك و گەورەکانی سەردەمەکەی دەژیا، نووسینەکانی لە هەناوی دژواری و شەڕ و ئاژاوەی سەدەی بیستەمدا دەخولقاند، ئەوەی وتارە سیاسییەکانی بخوێنێتەوە کە لە ڕۆژنامەی (کوسبا/ جەنگ) لە نێوانی سالآنی (١٩٤٤ تا ١٩٤٧) نووسیویەتی، ئینجا تێدەگا فەلسەفەی وجوودیەتی کامو ئەوپەڕی ئیلتیزامە بە ئینسان و خەمی دەستەبەرکردنی بەختەوەرییەکانی، تەنانەت هەندێك لە خوێنەرانی ئەوە نازانن کە کامۆ لە نێوان ئەدیبەکانی سەدەی بیستەمدا لە هەمووان زیاتر وتاری لەبارەی تیرۆر و تیرۆریزمانەوە نووسیوە، لەبارەی شەڕی موتڵەقی ئەو وڵاتانەی زانست و تەکنەلۆژیایان کردۆتە ئامرازی کوشتن. لە دوای شەڕی دووەمی جیهانییەوە بابەتی تیرۆر بە ئاشکرا دەکەوێتە ناو بەرهەمەکانی: وەك هەردوو شانۆگەریی (ئابلووقە/ ١٩٤٨ و یەکسانیخوازان/ ١٩٤٩ و ڕۆمانی تاعوون و کارە فەلسەفیە ناوازەکەی مرۆڤی یاخی)، لە هەموو ئەم کارانەیدا ئەوە دەسەلمێنێت کە توندوتیژی بەرانبەر توندوتیژی تەنیا تیرۆری تەواو و گشتگیری لێ دەکەوێتەوە، بەڵکو بە ڕەتکردنەوەی ئەو سیستەمە دەبێت کە کەرامەتی ئینسانی پەراوێز خستووە و ئازادییەکانی لەکەدار

کردووە، لەمەیش گرنگتر باس لەوە دەکەن کە ئاساییە کەسێك دژی داپڵۆسین بجەنگێت و دواتر خۆیشی ببێتە ستەمکار (وەك لە شانۆگەریی یەکسانخوازەکان باس لە کۆمەڵێك شۆڕشگێڕی ڕادیکالی ڕووس دەکات، دەیانەوێت قەیسەر بکوژن و یەکێك لە کارەکتەرکانی شانۆگەرییەکە ناوی کالیاییفە دەڵێت (ڕازی بووم ببمە بکوژ بۆ نەهێشتنی ستەم، بەڵام لە پشت ئەوەی دەیڵێم، دەبینم کە ستەمێکی تر لە ئاسۆدایە و دەمکاتە بکوژ لە کاتێکدا دەمویست ببمە یەکسانخواز)، ئەم بەرهەمانە پێش شەست و قسوور ساڵ نووسراون، کەچی بۆ ئێستایش دەشێن. هەر لێرەیشەوە لە ساڵانی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا (١٩٥٢) کامۆ لە کاری ڕێکخراوی یۆنسکۆ دەکشێتەوە، وەك ناڕەزاییەك بەرانبەر وەرگرتنی ئەندامێتی ئیسپانیا لە نەتەوە یەکگرتووەکان کە ئەوسا لەژێر حوکمی ژەنراڵ فرانکۆدا بوو.

لای من جوانترین شت لە دنیابینی کامۆدا ئەوەیە کە هەر هێندە کاری بە کۆمەڵ هەیە تاوەکو تەنیاییەکان و بەدبەختییەکانی ئینسان لەبیرباتەوە، کاری بە کۆمەڵ و کۆمەڵگا ئەوە نییە ببنە مێگەل و بە شوێن فکر و فەلسەفەی ئەو بکەون، ئیدیعای هیچ ناکات و هەوڵ بۆ هیچ تەجەموعێکی فکری و ئایدۆلۆژی نادات، ئەو دەزانێت ئینسان لە کۆتاییدا مەخلوقێکی تەنیایە و بە تەنیایش ڕووبەڕووی چارەنووسی خۆی دەبێتەوە، کەواتە لەو بیابانەدا با هەموومان گەرمایی بەیەك ببەخشین و کەسیش ئیدیعا خاوەن ماڵی نەکات: چونکە بیابان هی کەسمان نییە و هی هەمووشمانە.




کێ کۆڵن ویڵسۆنی بیرماوە؟

به درێژایی دەیان ساڵ، سەدان جار، خودی کۆڵن ویلسۆن باسی ئەو غەدرەی دنیای کردووە کە بەرانبەر داهێنەران کراوە، لە کۆتاییشدا لەگەڵ خۆیشی کرا: غەدری مردن.

سەدان جار و لە دەیان کتێب: باسی ئەو ناهەقیانەی دەکرد کە دەرهەق بە نووسەران کراوە کە چۆن دەبێ وڵاتێکی وەکوو ئەمریکا نەتوانێ ڕێگە لەوە بگرێ شاعیرێکی وەکو ئەدگار ئالان پۆ لەسەر جادە و لە شەوێکی بەستەڵەکدا بە هەڵکوڕماوی ڕەق ببێتەوە و بمرێ؟!

چۆن کرا وڵاتێکی وەکو فەرەنسا سەد فرەنك بۆ بۆدلێر دابین نەکات و لەسەر بەرگرییەکانی لە جوانی و ستاتیکا دوو سەد و پەنجا فرەنکی پێ قەرز بکا و لە بەرانبەر نووسینی پێنج شیعری ناوازەدا بیداتە دادگای پاریس، تەنیا بۆ ئەوەی زیندانی نەکرێ؟!

فەرەنسییەکان چۆن دەستیان چووە قاشقاشکردنی لاپەڕەکانی (گوڵەکانی خراپە)ی بۆدلێر، وەك ئەوەی گندۆرەیەك قاش بکەن؟!

کەس نەبوو لێنەگەڕێ ئارتۆر ڕامبۆ واز لە شیعر بێنێ و نەڕواتە حەبەشە و بازرگانیی چەك نەکات و بە قاچبڕاوی بێتەوە؟!

کەس نەبوو پارەی پاکەتە جگەرەیەکی ئەلدۆس هکسلی بدا؟!

هەموو ئەم ناهەقیانە بەرانبەر خودی کۆڵن ویلسۆنیش کرایەوە، بە چەند دیڕێك لە ڕۆژنامەی گاردیان خەبەری وەفاتی بڵاوکرایەوە کە لە پێنجی ئەم دیسەمبەرەدا مرد و... تەواو.

کۆلن ویلسۆن لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردوودا، لە تەمەنی بیستساڵیدا کتێبە نایابەکەی خۆی بە ناوی (بێ ئینتیما) بڵاوکردەوە، وەکو ئاگری ناو پووش تەشەنەی سەند، لە دوکانەکاندا چەشنی تەماتە و پەتاتە دەفرۆشرا، ڕوانگەیەکی نوێ بوو بۆ خوێندنەوەی ئەدەب و ئەدیبان، لە گەرمەی چەندوچوونی نێوان بیری سۆسیالیستی و سەرمایەداری، دەربەستبوون و یاخیبوونی ئەدەب، هونەر بۆ هونەر و هونەر بۆ گەل، شەقێکی مزر بوو بۆ هەموو ئایدۆلۆژیاکان و ئایدۆلۆژییەکان. گورزێك بوو لەوانەی ڕەخنەی ئەدەبییان وەك موعەلەبات بە خوێنەر دەفرۆشتەوە، سەرەتا پێش هەمووان ئەکادیمییەکان لێی هاتنە دەست و کەوتنە وێزەی کتێبەکە کە دەیسەلماند بە درێژایی هەموو مێژووی ئەدەبیات ئەوەی هەموو ئەدیبەکان کۆ دەکاتەوە تەنیا نووسینەوەی بێ جەدوایییە، دەیسەلماند ئەدەب تەنیا باسکردنی ئاوە: دەنا لە ژیاندا کەس مەلە نازانێت. دەیسەلماند ئێمە نەك هەر لە چاوەڕوانیی گۆدۆدا دەژین: بەڵکو گۆدۆ خۆمانین کە قەت ناگەین بە خۆمان، ئەکادیمییەکان بە پۆپیۆن و بۆینباخەوە بۆیان هەزم نەدەکرا کە چۆن دەکرێت ئەو کۆلن ویلسۆنەی لە شانزەساڵیدا خوێندنگای جێ هێشتبوو کتێبەکەی بێجگە لە کتێبخانەکان، تەنانەت لە واجیهەی دوکانی میوەفرۆشەکانیشەوە نمایش بکرێت؟! ئەدیبەکانی ناو سالۆن و کۆڕە ئەدەبیەکان لەوە نەدەگەیشتن چۆن دەکرێ گەنجێك لە تەمەنی بیست ساڵیدا بە جینزێکەوە لە گەڕەکی سۆهۆوە بێت و هەموو هۆڵەکان و قیژەی ناو مایکەکان یەکسان بکاتەوە بە سفر؟!

له تەمەنی نۆزدە ساڵیمدا بۆ یەکەم جار کتێبی (بێ ئینتما)م خوێندەوە، پێشتر ڕۆمانم زۆر خوێندبۆوە، بە تایبەتی ئەرنست هیمنگوای، ئەلبێر کامۆ، سارتەر. لە زۆربەی ڕۆمانەکاندا شتێك هەبوو نەمدەزانی چییە؟ تامێك هەبوو دەمناسییەوە بەس ناویم نەدەزانی، دۆزەخەکەی هەنری باربۆسم بە باشی خوێندبۆوە (بێ ئینتیما بە باسکردنی ئەو ڕۆمانە دەست پێ دەکا)، هەستم دەکرد ئەوەی دەیخوێنمەوە لە ئەدەبی کوردی ناچێ، ئەدەبی کوردی: ئەدەبیاتی ناسیۆنالیزمی سەرەتایی بوو، بریتی بوو لە پاراستنی زمانی پاراوی کوردی، کۆکردنەوە و ئامادەکردن و پێشەکی نووسین بۆ شاعیرە ون و بزرەکانی کورد، گوڵ لە شیعرەکانی نالی، خاوێنکردنەوەی زمان لە وشە بێگانەکان، قەدەغەکردنی کتێب و ناوهێنانی بە پەرتووك، حەرامکردنی قەڵەم و ناوهێنانی بە پێنووس و هتد.. ئەمە وێرانەی شیعری مەقاوەمە و شۆڕشگێڕانەیش لەولاوە بوەستێ: تا گەرمیی کوورە نەچێژێ کەستەك.. نابێ بە کەرپووچ کاکی بە پەستەك!

کتێبەکەی کۆڵن ویلسۆن تێیگەیاندم کە گرفتەکانی ئینسان زۆر لەوە قووڵترن، ئەو تامە نەناسراوەی بۆ پێناسە کردم کە بریتییە لە بێجەدوایی ئینسان و هەوڵەکانی، گرنگترین خاڵ ئەوە بوو کە چۆن ئێمە تازە سەرقاڵی دروستکردنی مەعنایین لە کاتێکدا هەموو ئەو تێکستانەی زیندوون و ماونەتەوە باس لە بێمەعنایی دەکەن، ئێمە تازە فێردەبین زمان دەپارێزین، لە کاتێکدا زمان خۆی زیندانە، زمان بۆ ئێمە دەرمانی دەردی کۆمەڵگایە و لای ئەوانیش پەتایە و ئاژاوە دەنێتەوە، ئەدەب بۆ

ئێمە چارسەرە و لای ئەوانیش نەخۆشی، ئێمە بە ئەدەب وەڵام دەدەینەوە، کەچی تێکستە زیندووەکان پرسیار و گومان دەکەن. تێیگەیاندم کە قسە ئاڵۆزەکانی هەنری باربۆس زۆر مەزنترە لە هەموو ئەو ئەدەبیاتەی ئایین و ئایدۆلۆژییەکان دەینووسنەوە، شیعرەکانی بۆدلێر زۆر گرنگترن لە هەموو ئەو فەردە شیعرە داخسوورانەی شیوعییەکان بە ناوی مافخوراوانەوە دەرخواردیان دەداین، ئیتر لەوێوە دنیابینیی من بۆ ئەدەب پەیوەندی بە نەتەوە و کۆمەڵگاوە نەما (وەك پەشێو و شێرکۆ بێکەس و لەتیف هەڵمەت هەیانبوو)، ئەدەب لای من هاتەوە لای ئینسان، ئەو ئینسانەی خۆیشی نازانێ بۆچی هاتۆتە دنیاوە، ئەوەی سورین کرکیگاردی باوکی وجوودییەکان دەیگوت: گەر من لەسەر دنیا ئەکتەرم ئەی کوا دەرهێنەر؟ دەمەوێ ببینم. تێگەیشتم ئەدەبی توندوتیژی هەر یەك شتە چا عەرەبێك بینووسێت دژی ئینسانی کورد، یان کوردێك بینووسێت دژی ئینسانی عەرەب، تێگەیشتم فاشییەت ئەو کاتە دەست پێ دەکا کە ئینسان دەخاتە ناو ئەدرێسێکەوە، دەنا ئەوەی نیکۆس کازانتزاکی خەونی پێوە دەبینی قەت نایەتەدی: ئاشتکردنەوەی نیتشە و مەسیح.

هەڵمەتێکی ڕاگەیاندنی چڕوپڕ لە دژی ئەدۆنیس هاتە ئارا، لەوەی گوایە ئەدۆنیس هەڵوێستێکی ناڕوون و نێگەتیڤانەی بەرانبەر شۆڕشی گەلی سووریا هەبووە و هەیە، ئەو هەڵمەتە پێشتر تەنیا لەلایەن لایەنگرانی عەوام و سەوادی شۆڕشی سووریا و ڕاگەیاندکارانەوە بوو، بەڵام ئێستا پەڕیوەتەوە بۆ ڕووناکبیران و شاعیرەکانیش، یەکێك لەو کەسە دیارانە نووسەر و بیرمەندی عەرەب سادق جەلال عەزم بوو کە لە وتارێکیدا ئەدۆنیس بە خائین وەسف دەکا، من لێرەدا نایەمە سەر بەرگریکردن لە ئەدۆنیس، چونکە خۆی قەڵەمێکە دەتوانێ بەرگری لە دید و دنیابینیی خۆی بکات، لە هەمانکاتدا خالیدە سەعیدی هاوسەری ئەدۆنیس وەڵامێکی درێژی ئەو تۆمەتانەی داوەتەوە. لێرەدا بە هەلی دەزانم بێمە سەر ئەو موعاناتەی کە چەندین دەیە ئەدیبان و هونەرمەندانی ئێمە بە دەستی حزبە کوردییەکانەوە چەشتوویانە. ئەدەبی کوردی بە گشتی لە سەرەتای ساڵانی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو لەسەر دەستی هەردوو جەمسەر (قەومییەکان و شیوعییەکان) تووشی پەتای هەڵوێست بوو، بە درێژایی ئەو هەموو ساڵە کەس بە شوێن دۆزینەوەی ئەدەبی جوان نەبوو، ئەدەب کە خۆی (ئەدۆنیس گوتەنی: بوونەوەرێکی زمانەوانییە) لە دەرەوەی زمان بە شوێن ئەدەبدا دەگەڕا، پێش ئەوەی تەماشای جوانی ئەدەب بکرایە، سەیری هەڵوێستی ئەدەبەکە دەکرا، پێش سەیری هەڵوێستی ئەدەبەکەش، سەیری هەڵوێستی ئەدیبەکە دەکرا، باشە ئەگەر کورد خاوەنی ئارتۆر

ڕامبۆ با و بیزانیایە نێربازی دەکا چۆن هەڵوێستێکی دەبوو؟!
ئەرێ ئەوانەی لەبارەی مستەفا بەگی کوردییەوە قسەیان کردووە و هاتوونەتە سەر باسی کاکۆڵەکەی قادر، چی ماوە لە قسەی ڕەق و جنێوی ناشرین پێی بدەن؟! ئەرێ مامۆستا شێرکۆ بێکەس لە شیعری (بۆننامە)دا چی ماوە نەیکات؟! ئەرێ لە کەناڵە بیستراو و بینراوەکانی هێندێ حیزبدا هەژار موکریانی گرنگتر نییە لە تۆفیق وەهبی و حاجی تۆفیقی پیرەمێرد؟! ئەرێ شۆڕشی چەکداریی کوردی چەند کۆلکە نووسەری لە ئێمە کرد بە سان جۆن پێرس؟! ئەرێ چەندین سان جۆن پێرسی لێ کردین بە کۆلکە نووسەر؟! بیست ساڵە لە کەناڵە بیستراو و بینراوەکانی خاوەندارانی شۆڕشی چەکداریی ئێمە کەس مانشێتێکی لە بارەی مامۆستا عەبدوڵڵا پەشێوەوە بینیوە؟! ئەو عەبدوڵا پەشێوەی پێش دروستبوونی زۆربەی حزبەکانی ئێمە شاعیر بووە، لەبەر خراپیی شیعرەکانی بووە یان لەبەر هەڵوێستەکانی؟! ئەدۆنیس ئێستا باجێك دەدا کە ئێمە دەمێکە لێی ڕاهاتووین، کولتووری ئەدەب، کولتووری هەڵوێست نییە. کولتووری ئەدەب کولتووری ستاتیکایە، باسترناك لە هەموو ئەو نووسەرە ئایدۆلۆژیانەی بردەوە کە پێش ئەوەی تێکستی جوان بنووسن، بە شوێن هەڵوێستەوە بوون. بەدر شاکر سەیاب هەموو دەسەڵاتە ڕەهاکانی شیوعیەکانی عێراق نەیانتوانی گەردێك لە داهێنانی کەم بکەنەوە. هەموو قەومی و مێژوونووسان نەیانتوانی بیسەلمێنن کە مستەفا بەگ لە سالمی ساحێب قەڕان شاعیرتر نییە. شۆڕشی شاعیر لەناو زماندایە، دەنا لە هۆمیرۆسەوە تا ئێستا کەسێك هەیە پێم بڵێ

کامە شیعر لەبارەی شۆڕشەوە نووسراوە و تا ئێستا زیندووە و بەهای هەیە؟! زۆر نا، یەك شیعر، یەك تێکست؟! ئەدەبیاتی کوردی لە ماوەی پەنجا ساڵی ڕابردوو بە هۆی فشاری ڕاست و چەپەکانەوە کەی ئەدەبی ئینسان بووە؟! هەمیشە ئەدەبی کۆمەڵگا و نەتەوە نەبووە؟ ئەدەبی دەستەجەمع نەبووە؟ کەی وردە خەونەکانی خەڵکی سادەی نووسیوەتەوە؟! بێگومان دوای ڕاپەڕین موعاناتی ئەدیبان و هونەرمەندانی کورد زیاتر دەبێ، چونکە لە شاخ حزبەکان هەر تەنیا حزبێك بوون، پارچەیەك بوون لە جەستەی کۆمەڵگا، جۆگەلەیەك بوون لە جۆگەلەکان، بەڵام دوای ڕاپەڕین ئەو حزبانە لە پەنا حکوومەت و پەرلەمانی کوردی (کە خەونی سەدان ساڵەی خەڵك بوون) خۆیان دەشارنەوە، هەر ئەدیب و هونەرمەندێکیش دژی ئەو حزبانە بووایە، ڕێك دەبووە دوژمنی خەونی سەدان ساڵەی خەڵك.

ئەدۆنیس تووشی بەڵاکەی لای خۆمان بووە: وەك چۆن دەبوا ئەدیبی کورد باس لە برینی کلکی جاش بکا ئینجا بلیتی شاعیریتی لە سەرکردایەتییەکان وەردەگرت، ئاواش ئەدۆنیس دەبێ شیعر بۆ کوشتنی شەبیحە و بەڵتەجی بنووسێ.

وەك چۆن دەبوا ئەدیبی کورد پێش ئەوەی ئینسان بێت کورد بێت، ئاواش ئەدۆنیس دەبێ جەبهەی نوصرە بە نوێگەر بزانێ بۆ ئەوەی بلیتی تازەگەری بخاتە باخەڵیەوە.

وەك چۆن ئەدیبی کورد دەبوا هەلهەلە بۆ براکوژی لێ بدا، ئاواش ئەدۆنیس دەبێ بەستە بۆ قەنناسەکانی قابوون بهۆنێتەوە.

کاری ئەدەبیات و مەعریفە ئەوەیە کۆمەڵگا پارچەپارچە بکا

و لە بەریەککەوتنی ئەو پارچانە پێشکەوتن فەراهەم بکا، نەك جیاوازی و فرەیی کۆمەڵگا بکوژێت و تەسلیمی یەك دید و یەك ئایدۆلۆژیا و یەك حزبی بکا.

دەیەها حزبی فەرەنسی هاتن و ڕۆیشتن، ئارتۆر ڕامبۆ هەر مایەوە. دەیەها میری بابانی و ئەردەلانی هاتن و ڕۆیشتن، نالی هەر مایەوە. دەیەها پاشای ئینگلیز هاتن و ڕۆیشتن، شکسپیر هەر مایەوە. دەیەها بەشار و سەیدا و ماخۆس دێن و دەڕۆن، ئەدۆنیس هەر دەمێنێتەوە.

(١)

چ گەمژەیەکە پێی وایە
بە پەڕۆی تۆزاوی لافیتەیەك
ئەو هەموو برینە بپێچێتەوە؟!

(٢)

چەند سەیرە
بە ناوی شۆڕشی عەقڵەوە
جەستە عاقڵ دەکەین و
لە بزێویەکانی خۆش نابین.

(٣)

بە ناوی ڕاوکردنی ئاسمانەوە،
جانەوەر لەسەر زەوی بڵاوبوونەتەوە.

(٤)

خەونەکان کەوتوونەتە چاڵی وشەکانەوە.
پەتـی چەنـد نائومێـدی لەمســەر و ئەوســەری تەمەن بکەیـنە تەناف و
لۆچەکانی ڕوخسارمانی لەسەر هەڵخەین؟

(٥)

تاکەی خەریکی وشککردنەوەی بامیەکانی مەراق بین؟
لە پرسەی بە سەرابیوونی چەند نزا دانیشین و
بڵێین خۆتان خۆش؟

(٦)

شاعیر بەدەست زمانەوە چەند بەستەزمانە
دەزووی بەستنەوەی خەونی بە عەردەوە ون کردووە.
زمان چەند بەستەزمانە بە دەست سیاسیەکانەوە
هەمووی پێی وایە نووحە و تەنیا لافاویشی لایە.
قسەکانیان لەبارەی باشترکردنی واقیع
مەجازیشی تێپەڕاندووە.

(٧)

لەوەتەی هەن
ئایین و شۆڕش
بەهەشتێکی ئاڵۆزمان بۆ دەچێنن.
لەوەتەی هەین
دۆزەخێکی ڕوون دەدوورینەوە.

(٨)

دەپرسین
دەنکە زیخی ئەو وەسفە نارێکانە

لە سپێنەی چاوماندا دەربێنین.

ناپرسین

کێ ئەو هەموو گوڵەگەنمانەی سەرمانی لێ کردین بە (کا)؟

کێ میراتی ئێمەی دەوێ؟

کە تەنیا نووسینەوەی ئەو شتانەیە

کە بە چاو ناخوێنرێنەوە.



## یـەشار کـەمال

## کە دەیتوانی بە گێڕانەوە سەرت سپی بکا

خۆی گوتەنی (ئەو لە شێوەی ئەو دێوەیە کە چڵ گۆرانیی جیاوازی لەبارەی سێوەوە دەزانی، بەڵام لە ڕاستیدا گۆرانییەکانی لەبارەی سروشت و کوشتنی سروشتەوەیە). لێرەوە یەشار کەمال وێڕای ئەو نەهامەتییانەی منداڵی، هێشتا بەرگری لە سروشت و ئینسان دەکا، وێڕای ئەوەی لە تەمەنی چوار ساڵ و نیویدا و بە بەرچاوی خۆیەوە باوکی دەکوژن و چەند ساڵێك نوتقی نامێنێ. وێڕای ئەوەی لە عارفەی جەژنی قوربانێکدا خاڵە گەورەکەی سەرقاڵی کەوڵکردنی مەڕێك دەبێت و چەقۆ دەپەڕێت و چاوێکی کوێر دەبێت، کەچی ژیان و جوانی بە ڕوونی و سادەیی دەبینێت. ئەگەر مارکیز لە منداڵیدا سەرسام بوویێت بەو غەجەریانەی دەهاتن و سێرکیان ساز دەکرد و لەوێشەوە باپیرەی دەستی دەگرێت و بۆ یەکەمین جار لەپی دەخاتە سەر سەهۆڵ و دەڵێت (ئای چەند گەرمە)، ئەوا بە هەمان سرووش یەشار کەمال سەرەتای شیعرنووسینی بە کاریگەریی ئەو شاعیرە گەڕۆکانە دەست پێ دەکا کە حەوت شەو و حەوت ڕۆژ لە (چکوراوە)، بەسەر یەکەوە داستان و ڕووداوەکانیان بە شیعر دەگێڕایەوە. ڕاستە لە ڕۆژی پێنجشەممە، پانزەی مانگی یەکدا نووسەری ناوداری کورد یەشار کەمال لە تەمەنی نەوەد و دوو ساڵیدا بە هۆی تەنگەنەفەسی و لێدانی ناڕێکی دڵی، برایە نەخۆشخانە، بەڵام زۆر زووتر: بە هۆی نەبوونی ئازادی و چەوسانەوەی نەتەوەیەکی چڵ ملیۆنی و هەستکردن بە غوربەت و مەنفای ژیان و زمان، تەنگەنەفەس ببوو، مەنفای ناو ژیانی ئاشکرایە و

لای زۆربەی نووسەران هەیە، بەڵام مەنفای ناو زمانی ئازاربەخش بوو، هەست و کێشەکانی ئینسانی کورد بە ناچاری دەخرانە ناو ئەبجەدیەتی تورکییەوە، چەند ئەستەمە بەو زمانەی بەسەرتا چەسپێندراوە، هاواری پێ بکەی؟ چەند زەحمەتە بەو ئەبجەدیەتەی بۆتە چوارچێوە و قەفەس، گۆرانی بۆ جوانی و ئازادی پێ بچڕی؟ لەو پێناوەدا و بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو واقیعە، لە شێوەی نووسەرە مەزنەکان تەنیا پەنای بۆ خەیاڵ و گێڕانەوە بردووە، پەنای بۆ ئاوێتەکردنی داستان و ڕاستی بردووە، هەر بۆیە نووسینەکانی پڕن لە کەسایەتیی ئازا و فریادڕەس، تا ئەو ڕادەیەی یەکێک لە پاڵەوانەکانی کاتێ دەکوژرێت و سینگی شەق دەکەن، دەبینن چوار دڵی هەیە. دەگمەنی و ناوازەیی چیرۆك و شانۆگەری و ڕۆمانەکانی یەشار کەمال لەوەدایە بۆ خەڵکی سادە دەنووسێت و کەچی بەهای هونەریش لەدەست نادا، ئەم دەگمەنییە مەگەر تەنیا لە چیخۆف بوەشێتەوە. لەو وتارەی لە ڕۆژنامەی (ئاوێنە)ی ئەڵمانیدا لە ساڵی ١٩٩٥ بە ناونیشانی (کێڵگەکانی مردن) بڵاوی کردەوە، ترۆپکی هەڵوێستی یەشار کەمال دەنوێنێت: کاتێ باس لە زوڵمی سەدان ساڵەی تورکیا دەکات بەرانبەر بە کورد و لە قوڕنانی زمان و سووتاندنی دوو هەزار گوند و ئاوارەکردنی سێ ملیۆن ئینسان و کوشتنی سەدان نووسەر و ڕووناکبیر و نەفیکردنی سەدان پارێزەر و دکتۆر و مێشکی زانستی بە شێوەیەکی مەنهەجی و لەسەر دەستی دەزگا ڕەسمییەکانی دەوڵەتەوە، وەك پلانێك بۆ لەناوبردنی نەتەوە و نەژادی کورد. لەو ڕێوڕەسمەی بۆ

وەرگرتنی خەڵاتی دکتۆرای فەخری لە زانکۆی بوکازئیجی، یەشار کەمال لە وتەی وەرگرتنی خەڵاتەکەدا بەم شێوەیە باسی ململانێی و هەماهەنگی کولتوور و شارستانییەتییەکان دەکات و دەڵێت: "ئەوەی گرنگی بە خوێندنەوەی کتێبەکانم دەدا، لەسەریەتی نەبێتە بکوژ، بەڵکو ببێتە دوژمنی شەڕ، پێویستە بکۆشێت لە دژی چەوساندنەوەی مرۆڤ بۆ مرۆڤێکی تر، کەس مافی ئەوەی نییە بە قێزەونی تەماشای ئەوی تر بکات و لە بەرانبەریدا سیاسەتی پاکتاوی نەژادیی پەیڕەو بکا، پێویستە ڕێگە لەو ڕژێم و حکوومەتانە بگیرێت کە سیستەمی پاکتاوی نەژادیی بەسەر گەلانیدا دەسەپێنێ. ئەوانەی گرنگی بە خوێندنەوەی کتێبەکانم دەدەن، دەبێ بزانن ئەو ڕژێمانەی کار دەکەن بۆ لەناوبردنی ڕۆشەنبیرییەکانی تر، خۆیان ڕۆشەنبیری و مرۆڤایەتیی خۆیان لەدەست داوە. ئەم کێشانە مەبەستم لێی وڵاتی خۆشمانە، کە بۆ ماوەی هەشتا ساڵ زمانەکانی دیکەی قەدەغە کرد، بەڵام دەبێت حکوومەتەکان بزانن بەم کارەیان ڕۆشنبیریی خۆشیان لەناو دەچێت".

لەگەڵ ئەو سی و قسوور ڕۆمانەی نووسیویەتی، کە بۆ سی و قسوور زمانی زیندووی جیهانییش وەرگێڕدراون، لەگەڵ ئەو سی و قسوور خەڵاتە نێودەوڵەتییەی وەریگرتوون، کە سێ دکتۆرای فەخری تێدایە، هەمیشە پرسیاری ئەوە دەکرێت بۆچی نۆبێلی ئەدەبیاتی وەرنەگرت؟ لەبەر ئەوەی کوردە؟ بەڵێ بە دڵنیاییەوە. خۆ من نەك لە ئەدەبدا بەڵکو لە پرسە کۆمەڵایەتییەکانیشدا باوەڕم بە تیۆری موئامەرە نییە، بەڵام لەمەی

لەمەڕ یەشار کەمالدا باوەڕم پێیەتی، دەوڵەتی کەمالیستی تورکیا لەبەر دوو هـۆی زۆر جەوهەری ڕقێکـی مێژوویـی بەرانـبەر بە یەشار کەمال هەبووە، یەکەم لەبەر ئەوەی کوردە و دووەم لەبەر ئەوەی چەپ بـووە، دەوڵەتـی تورکیـا و ئـێمە و خـوێنەران و خـودی یەشـار کەمـالیش دەزانـین کە تەنیـا پیـت و وشـەکان تـورکین، دەنـا کەسـایەتی و کـارەکتەر و سروشـت و گرفتـی ئینسانەکان و کەشوهەوای چیـرۆك و شـانۆگەری و ڕۆمانەکـانی کوردین، بـۆیە دەبینـین دەوڵەتـی تورکیا بەرانـبەر بەو نووسـەرە مەزنە (کە بە میراتگری ستاندال و ولـیەم فـۆکنەر دەدرێتە قەڵەم و دوایـین قەڵاکـانی کلاسـیزمە)، نەك هەر پشـتگیری ناکـا، لەوە خراپتر: زیندانی دەکات و ڕاوەدووی دەنێت و تۆمەتی پشـێوی-نـانەوە و تێکـدانی ئاسایشـی نەتەوەیـی دەداتە پـاڵ، هەموومـان دەزانین بۆ خەڵات تەنیا باشنووسین بەس نییە، بەڵکو سەپۆرت و پاڵپشـتی دەزگـایی و دەوڵەتـی و تەبەنیکردنـی نووسـەر ڕۆڵـی کـاریگەر دەگێـڕن، ئەم دنیـایە چەنـد دووڕووە، نەك کـوردە نەناسراوەکانی نزیك مەخموور و خازر و شەمامك، نزیك لەیلان و ناسـاڵح و خـانەقین، تەنـانەت کـوردێکی ناسـراوی جیهـانی بە قورسایی یەشار کەمالیش: باجی کوردبوون دەدەن.

(١)

کورد وەك چۆن لە جیهاندا لە سۆنگەی سۆز و بەزەیی بۆ نەتەوەیەکی مەینەتبەش سەیری کراوە، ئاواش سەیری ئەدەب و هونەری کراوە، کە ئەدەب و هونەری نەتەوەیەکی زوڵملێکراوە، بۆیە دەبینی یەك- دوو شاعیری کورد بە درێژایی مێژوو تەنیا خەڵاتی "تۆخۆلسکی"یان وەرگرتووە، ئەو خەڵاتەش دوورونزیك نرخ و بەهای هونەری نییە، بەڵکو خەڵاتی دابینکردنی بژێوییە، لەوێشدا هەر لە کونی دەرگای بەزەیی و عەتفەوە تەماشای ئەدەب و هونەرمان کراوە، بۆیە دەبینی ئێمە شاعیری پلەیەك و هونەرمەندی پلەیەکمان نییە، چونکە ئەوە پەیوەندی بە تەبەنیکردنی دەزگای جیهانیی گەورەوە هەیە بۆ وەرگێڕان و بڵاوکردنەوە، پێم وایە چەندین ساڵی دیکەش شاعیرێکی باشی کورد نابینی دەقەکانی وەرگێڕدرێن بۆ زمانەکانی دنیا، ئەوان تەنیا پێویستیان بەو شیعرانە هەیە کە باشترین نموونەی پاڕانەوەی کوردن لە خۆرئاوا، جیهانیش بە شوێن جوانییەکانی کورددا ناگەڕێت، هێندەی نەغمەی ئەو نووسینانەی پێ خۆشە کە وەك فریادڕەس وێنای دەکات.

(٢)

ئەو گرفتانە زۆرن کە ڕووبەڕووی نووسەر و ڕەخنەگرانی ئێمە دەبنەوە، وەك جیاکردنەوەی ڕەگەزی، ناوچەگەرێتی، پەیوەندییە کەسێتییەکان، بیری هۆزگەری و تاقم تاقمێنە لە سەراپای ژیانی ئێمەدا بوونی هەبووە و هەیە، لە سیاسەت و کۆمەڵایەتی و ئەدەبیشدا تاکی ئێمە بە گشتی هەست بە ئەمان ناکات گەر خۆی نەخاتە پاڵ شتێکەوە، بۆیە دەبینین لە هەموو بوارەکاندا هەر یەکێکمان پاڵی داوە بە ئەوەی تردا و ئەویش لە پاڵ ئەوەی تردا پاڵکەوتووە، هەندێك لەوانەی بۆ نموونە لە حزبێکدان یان لە ڕێکخراوێکدا کار دەکەن، لەبەر ئەوە نییە کە پێی وایە یەك دنیابینی و ئایدیای هاوبەشیان هەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کەوا دەزانێت ئەوانی دیکە دەیپارێزن. واتا گرێبەستێکی هاوبەشە بۆ بەرگری و پاراستنی هاوبەشانە. خۆرئاواییەکان دەمێکە دەزانن کە فاشییەت ئەوەیە تاکێك بخەیتە ناو ئەدرێسێکی گشتی. گەر ڕوونتر بین: کاتێ خۆرئاواییەك، تاکێکی عەرەب دەخاتە ناو ئەدرێسی موسڵمانێتی، ئەوا شەرعییەت دەداتە تۆمەتی تیرۆریستبوون و لەوێوە هەموو عەرەبەکان لە ڕوانگەی کۆمەڵی خۆرئاواییەوە ناشیرین دەکات و شەرعییەت دەداتە ئەزیەتدانی ئەو تاکە عەرەبە، یان بۆ نموونە، کاتێ کوردێك یان عەرەبێك یەکتر دەخەنە ناو دروشمێکی گەورە، ئەوا شەرعییەت دەدەنە ئەزیەتدانی یەکتر، بەڵام گەر بێنە سەر تاکێتی و مرۆڤبوون، ئەوا ناتوانن یەکتر قبووڵ نەکەن، من کوردم بینیوە پێی وابووە پێویستە عەرەبەکان لە بازگەکاندا

سەغڵەت بکرێن، بەڵام ئەو کوردە گەر بێتە سەر ئەوەی ئەو عەرەبە چەند بە نەهامەتی ژیاوە و منداڵەکانی لەبەر هەتاو دەوەستن و ڕەنگە بۆ چارەسەری ژنەکەی هاتبێتە کوردستان، ئەوا ناتوانێت ڕێزی نەگرێت، بێگومان عەرەبیشم بینیوە هەر بە هەمان شێوە بیر بکاتەوە. لە ئەدەبیشدا کاتێ بمەوێت بتسرمەوە ئەوا دەتخەمە ژێر دروشمێکی گەورەوە و پێویستە تۆ باجی هەموو خراپییەکان بدەیت، لەژێر دروشمی گشتیدا دەتشارمەوە، وەك ئەدەبیاتی هەولێر یان سلێمانی، ئەدەبیاتی مێ یان ژنان، ئەدەبیاتی لاوان یان گەنجان. بەڵام گەر وەکو مرۆڤ وەکو تاك بێمە سەر ئەوەی چەند بە ئەزیەت دەخوێنیتەوە و دەنووسیت، ئەوا بێگومان ناتوانم ڕێزی بەرهەمەکانت نەگرم، لە ناوەندی ئێستای ئەدەبی کوردیشدا ئەو گشتاندنە تەنیا بۆ سڕینەوەی تاکەکانە. تۆ وەکو تاك دەنووسیت و دەخوێنیتەوە کەچی دەتخەنە ناو گرووپ و تاقمێکی دەسنیشانکراو، تاوەکو بەرهەمی ئینسانیانەی تۆ ون ببێت و باجی بازنەی ئەو تاقم و گرووپە بدەیت. لێرەوەش پەرە بە بیری ناوچەگەریتی و ئینتمای حزبایەتی و گرووپایەتی دەدرێت و بەرهەمە زاتییەکەت لەناو دروشمێکی گشتیی ناشیریندا نقوم دەکەن. ڕەوا نییە دەستەواژەی (داهێنانی ئەدەبی) بخرێتە پاڵ ئەو گرووپ و تاقمخوازییە..
دنیای ئێمە دنیایەکی جەنجاڵ و پڕ لە دروشمی بەتاڵ بووە، مێژووی ئێمە مێژوویەکی تاسەر ئێسقان درۆزنە، ئەو مێژووەی هەموومان دەیزانین، ئەو مێژووە نییە کە منداڵەکانمان لە کتێبی قوتابخانەدا دەیخوێنن، لە کتێبەکاندا هەموومان پاڵەوانین، کورد هەمووی فریشتە بووە، لە ڕاستیشدا مێژووی ئێمە حیکایەتێکی

دوورودرێژە لە بەتاڵی و نەهامەتی، ئەو مێژووە ساختەیەش وەك هەموو بوارەکانی دیکە، شیعریشی گرتۆتەوە، شیعر لەناو فەزای زماندا کار دەکات و هیچ پەیوەندییەکی بەو قسە سەقەتانەوە نییە.

(٣)

بوونی "مانیفێستی ئەدەبی" بۆ مێژوو زۆر گرنگە، ئەدیبانی ئێمە بە باشی ئاوڕیان لە بەهای بڵاوکردنەوەی مانیفێست نەداوەتەوە. زۆربەی ئاراستە و ڕەوتە ئەدەبییەکان لە دوای مانیفێستەوە خۆیان سەلماندووە و بوونەتە قۆناغێکی جیا لەوانی پێش خۆیان. لە دەرەوەی ئەو بەهایە گەر بێینە سەر تەجاوزکردن، ئەوا من پێم وایە هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆ نییە لە نێوان بەرهەمەکانی پێش و پاش بڵاوکردنەوەی مانیفێستەکان. بۆ نموونە جیاوازی شیعرێکی شێرکۆ بێکەس چییە لە پێش و لە دوای بڵاوکردنەوەی مانیفێستی ڕوانگە؟! بێگومان هیچ. حسێن عارف دوای بڵاوکردنەوەی مانیفێستی ڕوانگە ئایا زمان و داڕشتن و تەکنیکی چیرۆکەکانی گۆڕا؟! بێگومان نەخێر. خۆ دوای ڕوانگە، جەلالی میرزا کەریم شیعری جیاوازی نەنووسی! بەڵام ناکرێت لە مێژووی شیعری تازەی کوردیدا باس لە گرنگیی مانیفێستی ڕوانگە نەکرێت، هەرچەندە بۆ خودی بەرهەمی ئیمزاکەرانی مانیفێستەکەش هیچ ئیزافەیەکی ئیبداعی نەبوو، بەڵام هەر بەهای مێژوویی خۆی پاراستووە.



# موگناتیسی سیاسەت و مەعــدەنــەکــانــی ئــەدەب

(١)

بیرم نییە کێ گوتوویەتی کە (ناسکترین شیعر درۆزنترینیانە)، بەو مانایەی کە مەجاز مەودایەکی فراوانی لە زماندا داگیرکردووە، ئەودیوی واقیع و شتەکان دەدرکێنێ، مانایەکیتر بۆ ماناکان و لە ماناکان موتوربە دەکا. ئەوەی لە ڕووبارە گەورەکەی شیعری کوردی ڕوو دەدا ڕێك بە پێچەوانەوەیە: ئەو شیعرانەی ڕاستگۆن بەرانبەر بە واقیع و شتەکانەوە باشتر و زۆرتر گرنگییان پێ دەدرێت لەلایەن میدیا ڕەسمییەکانەوە، ئەوانەی دیوی یەکەم و ڕووکەش دەبینن، ئەوانەی لە تەنکەئاودا یەکدوو قەف پانتۆڵیان لێ هەڵکردووە و گاڵتە بە بانگەوازە ناوازەکەی ئارتۆر ڕامبۆ دەکەن کە بە نووزەیەکی نزمەوە بانگی دەکرد: (دەی ئەی نەفسی ئازیزم: بەرەو دەریا، بەرەو قووڵایی دەریا).

ئەم نەهامەتیی ڕاستگۆییەی شیعر (کە یەکسانە بە درۆی سیاسەت) لە سەرکەوتنی گوتاری سیاسییەکانەوە دێت بەسەر گوتاری ڕووناکبیرییەوە، ئەمڕۆ سیاسییەکان بەرژەوەندییان یەکسان کردووە بە بە ڕاستگۆیی و هەر شاعیرێکیش لەسەر خوانی ئەو (بەرژەوەندی- ڕاستگۆییە) دانەنیشێت ئەوا بە خۆی بە مەجازەکانییەوە لە دەرەوەی هاوکێشە ژیاری و شارستانییەکانە.

ئەوەی ئێواران سەیری تەلەفزیۆن بکا
تێدەگا ئەم نیشتیمانە لای سیاسییەکان
لە بتی خورمای سەردەمی جاهیلی دەچێت:
بە شەو دەیپەرستن و بە ڕۆژ دەیخۆن.

(٢)

هەقە بۆ ئەو گەلانەی کە تازە لەژێر داگیرکاری نەجاتیان دەبێ و ئازاد دەبن و شۆڕگێڕەکانی دەسەڵات دەگرنە دەست، ئەوا خەڵکەکەی دەستبەجێ ڕۆمانەکەی "سەلمان ڕوشدی" بخوێننەوە (منداڵانی نیوەی شەو) تا بزانن شۆڕش چۆن هەمیشە لە بۆسەدایە لە دژی ئەولادە شەرعییەکانی خۆی. چۆن هەمیشە مردووەکانی شۆڕش هەموو ژیان و پرۆژەکانی زیندووانی پێ تەئجیل دەکرێ، ئەو زیندووانەی بەشداریی شۆڕشیان کردووە چ بەلایەکن بەسەر هاوەڵە شۆڕشگێڕەکانیانەوە کە دواتر بوونەتە دەسەڵات، نایانەوێ تەنانەت بیانناسن و بشیانبینن، تاکو زیندووانی ئەمڕۆ چیرۆکەکانی ڕابردوویان بە بیر نەهێننەوە، ئێمە لەژێر یادکردنەوەی مردووەکانەوە نغرۆ بووین و زیندووەکانیش بە بێدەنگی فەرامۆش کراون.

لەم وڵاتەی ئەدۆنیس گوتەنی:
کە (تەنیا مردووەکانی لەسەر هەقن)
ڕۆژانە هەر خەبەرێك دەبیستم
بە دەست خۆم نییە ئەم دێڕەی موتەنەبی دەڵێمەوە:
وَمَنزِلٍ لَيسَ لَنا بِمَنزِلِ

(٣)

هەمیشـە ئەو پرسـیارەمان پـێ وەڵام نەدراوەتەوە کە بـۆچی هونەری کاریکاتێر هونەرێکی دوورەپەرێز و فەرامـۆش کـراوە؟ هونەرێکە بە بارتەقای گرنگیی خۆی بـێ نـرخ کـراوە و ئـاوڕی شایستەی لـێ نەدراوەتەوە، ڕەنـگە هونەرمەنـدانی کاریکاتێرسـتی کوردی خەمبارترین هونەرمەند بن لەناو ژانرە هونەرییەکان.

چۆن دەکرێ تراژیدیای خەونەکانمان بنووسینەوە،

لە کاتێکدا:

واقیع خۆی بۆتە نوکتە.

(٤)

ئای لە مانای ئەو ڕەنگە زەردەی ئێستامان

چەند جیاوازە لە تامی ئەو کێکە زەردەی

لە منداڵیمدا

داپیرەم بە دزی هەژارییەوە دەیدامێ.

(٥)

شیعری باش خولیـای جـوانییە و کـاری بەسـەر هەقەوە نیـیە، گەر داشـمان نـا کـاری بەسـەر هەقەوە هەیە، کـامە هەق؟! کـێ خاوەنی هەقیقەتە لە نێوان ئەو هەموو مۆنتاربۆیـانەی لەسـەر بـانی بارەگاکانی حزب و لە کەناڵی سیاسەت و لە منارەکانەوە دێـن؟

کێ ڕاستە لەناو ژاوەژاوی بانگەوازەکان؟ ئایا لە ئەخیردا مرۆڤ بـوونەوەرێکی تەنیا نیـیە؟ (تەنیـایی شـاعیر واتـا یەکسـانبوونی ناوەوەی شاعیر بە ئەوانی تر و پێچەوانەکەیشی هەر ڕاستە. دەبـا بڕۆینەوە لای ئەو شاعیرەی کە دەڵێ (تەنیایی دارستانە، بەڵام بە تاقەدرەختێك).

بەڵێ: لە نووسین دەترسم، گەر لە بەیانی تا ئێوارە کارێکی تاقەتپڕووکێن بکەم، هێشتا ئاسانترە لە نووسین. بیرم نییە کێ گوتوویەتی، بەڵام لە نووسەرێکم خوێندووەتەوە کە (نووسەری باش بەوە ناناسرێتەوە چەندی بڵاو کردووەتەوە، بەڵکوو بەوە دەناسرێتەوە چەندی دڕاندووە)، سروشتی نووسین خۆی بریتییە لە چڕبوونەوەی زمان، ئەوەی تا ئێستا بە گشتی لە نێوەندی نووسەرانی ئێمە، بە تایبەتییش شاعیرانمان گوزەراوە، پێچەوانەکەیەتی، شیعر بریتی بووە لە پەرتبوونی زمان، هەر بە سادەیی با بڵێین شەربەتی پرتەقاڵ پەرداخێکی بۆ پێنج پەرداخ ئاو بەکار دێت، ئەوا گەر پەرداخێك شەربەت بکەیتە مەسبەحێك ئاوەوە چی لێ بەسەر دێ؟ بێگومان نە ڕەنگی دەبێت و نە تام و نە بۆن، لێرەدا دەبینین بیرۆکەیەکی باو و ناسراو و زانراو دەخرێتە ناو تێکستێکی درێژدادڕەوە، ئەمە وێڕای ئەو داستانە شیعرییە چوار-پێنج سەعاتییانەی وەك گۆرانییەکانی ئوم کەلسوم پێویستە گوێگر دوو پاکەت جگەرە بکێشێ و عەلاگەیەك گوڵەبەڕۆژەی بە دیارەوە بخوا.

ڕاستە کورد شاعیری زۆرە، بەڵام کەمترین شیعری هەیە، شاعیرانی ئێمە لە کایەی ڕۆشنبیریدا چالاکن، بەڵام لە کایەی داهێناندا زۆر تەمبەڵن. ڕۆشنبیریش جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ داهێناندا، بیرمان نەچێ سیاسییەکانیش ڕۆشنبیرن، کاربەدەستانیش ڕۆشنبیرن، بازرگانەکانیش ڕۆشنبیرن، لەبەر ئەوەی ئامرازەکانی ڕۆشنبیریدزینیان ئاسانە، کاربەدەستێکی

خراپ دەتوانێ تەنیا لە ڕێی خوێندنەوەی ڕۆژنامەوە هەرچی ئامرازەکانی گوتاری ڕۆشنبیرییە تاڵانی بکات و وەکوو شاعیران و ڕەنگە باشتریش بە خەڵکی بفرۆشێتەوە، بۆ کاربەدەستانی وڵاتی ئێمە ڕۆشنبیر نین؟ بارزگانەکانی وڵاتی ئێمە، حزبەکانی وڵاتی ئێمە ڕۆشنبیر نین؟ ئامرازەکانی ڕۆشنبیریان پێ نییە؟ بەڵام کامەیان داهێنەرن؟ لەبەرچی؟ لەبەر ئەوەی داهێنان بریتییە لە دۆزینەوە، لە تێڕامانی مرۆڤ بۆ ناوەوەی خۆی و دەرەوەی خۆی، نەك وەك ڕۆشنبیری کارکردن بێت لەسەر گوتارێکی گشتیی زانراو و باو و ناسراو، ئەو گوتارەش پیادە بکرێت بە ئامرازی دزراو.

شیعری کوردی بە گشتی و لە پەنجا ساڵی ڕابردوودا زۆر بە دەستی ڕۆشنبیرییەوە ناڵاندوویەتی، شیوعییەکان و قەومییەکان هەمیشە شیعریان بە ئاراستەی ڕۆشنبیریدا بردووە، لە کاتێکدا پێویستە شیعر ئاراستەی ئیستاتیکی وەرگرێت، بۆیە سەرت ناسوڕمێ گەر ببینیت بە شیعر داوای خزمەتگوزاری و باشترکردنی ئەدای حکوومەت دەکرێ و کەمتەرخەمییەکانی پارێزگا و شارەوانی لە شیعری کوردی ببینیت، ئەوەی مەبەستمە بیڵێم ئەوەیە کە شیعر چالاکییەکی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکوو کارێکی فەردانییە و نرخ و بەها لە خۆیەوە وەردەگرێت، نەك وەك ئەوەی دەیبینین بەهای شیعر پەیوەستە بەوەی چەند سوودی هەیە، شیعر بۆ زەرەر و قازانج نانووسرێت، بەڵکوو بۆ جوانی و ناشرینی. کورد وەك چۆن لە جیهاندا لە سۆنگەی سۆز و بەزەیی بۆ نەتەوەیەکی مەینەتبەش سەیری کراوە، ئاواش سەیری ئەدەب

و هـــونەری کـــراوە، کە ئەدەب و هـــونەری نەتەوەیەکـــی زوڵملێکراوە، بۆیە دەبینی یەك-دوو شاعیری کورد بە درێژایی مێـژوو تەنیـا خەڵاتـی تۆخۆلسـکیان وەرگرتـووە، ئەو خەڵاتەش دوور و نزیـك نـرخ و بەهـای هـونەریی نییە، بەڵکـوو خەڵاتـی دابینکردنی بژێوییە، لەوێشـدا هەر لە کـونی دەرگـای بەزەیـی و عەتفەوە تەماشای ئەدەب و هونەرمان کراوە، بـۆیە دەبینـی ئـێمە شـاعیری پـلەیەك و هونەرمەنـدی پلەیەکمـان نییە، چـونکە ئەوە پەیوەندیی بە تەبەنیکردنـی دەزگـای جیهـانیی گەورەوە هەیە بـۆ وەرگێـڕان و بڵاوکـردنەوە، پـێم وایە چەنـدین سـاڵی دیـکەش شـاعیرێکی باشـی کـورد نـابینی دەقەکـانی وەرگێـڕدرێن بـۆ زمانەکـانی دنیـا، ئەوان تەنیـا پێویسـتیان بەو شـیعرانە هەیە کە باشترین نمـوونەی پـاڕانەوەی کـوردن لە خۆرئـاوا، جیهـانیش بە شـوێن جوانییەکـانی کـورددا ناگەڕێـت، هێنـدەی نەغـمەی ئەو نووسینانەی پێ خۆشە کە وەك فریادڕەس وێنای دەکات.

قەت ئەو هەڵوێستەی بۆدلێرم بیر ناچێ کـاتێ لەسـەر دیـوانی (گوڵەکانی خراپە) درایە دادگا و بەپێـی یاسـای بڵاوکراوەکـانی فەرەنسای ئەوکات پێنج قەسیدەیان لە کتێبەکەی بۆدلێردا قەدەغە کرد و بڕی (٣٥٠) فـرەنکیش غەرامە کـرا، بـۆدلێر کە بە هەزار قوڕبەسەری توانی ئەو بـڕە پـارەیە قەرز بکـات و بیـداتە دادگـا، کەچـی ئەوەی پـێ نـاخۆش نەبـوو، بەڵکـوو لەگەڵ داواکـارە گشـتییەکە لە هـۆڵی دادگـا کردبـووی بە شـەڕ کە بـۆچی لە مورافەعەکانـدا بـۆدلێری بە شـاعیری واقیـع و کـۆمەڵگە نـاو بردووە؟ پێش ئەو هەموو ساڵە بـۆدلێر شـیعری دەستەجەمعی بە

شکست و نەهامەتی وەسف دەکرد، کەچی لە ئێستاشدا شاعیری کورد هەیە بە ویستی داواکاری گشتی شیعر دەنووسێت. نێوانی نووسەر و خوێنەر زۆر لە پەیوەندیی نێوان دوو عاشق دەچێت، پێویستە هەمیشە شتی نوێ بە یەکتر ببەخشن، دەنا دەبێتە پەیوەندییەکی ئاسایی و ئەو ئیشراقەی تێدا نامێنێت، خوێنەری ئێستا چەند جارێك فرسەت بە نووسەرێك دەبەخشێ، گەر هەستی کرد هیچی نوێی تێدا نییە، ئەوا تەنیا ناوەکەی ببینێت نایخوێنێتەوە، بۆیە مەرجی ڕاگرتنی ئەو پەیوەندییە لەسەر نووسەر وەستاوە بەردەوام خۆی و بەرهەمەکانی نوێ بکاتەوە و تازەگەری ببەخشێت.




## ڕامیار مەحموود

## لە نێوان دووانەی ڕۆشنبیری و داهێناندا

بۆ ئەوەی ئەمین بم، لە ماوەی بیست و پێنج ساڵی تەمەنی سەرقاڵیم بە خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنی ئەدەبیاتی کوردییەوە، دوو ئاراستەم هەست پێ کردووە، دوور و نزیکیش ئەوەندەی من بزانم ئەو دوو ئاراستەیە باس نەکراون، کە بریتین لە ئاراستەکانی دارشتن و تەکنیکی شیعری و ماناخوازی لە لای مەحوی و نالی. دیدگای نالی وەک شاعیرێکی تەکنیکخواز و دیدگای مەحوی وەک ماناخواز. ئەو سیمایەش شتێکی تایبەت نییە بە ئەدەبیاتی کوردییەوە، بەڵکو مێژوویەکی درێژی هەیە لەناو ئەدبیاتی جیهانیشدا، بۆ نموونە: ئایا تەکینکخوازیی دیستۆیفسکی گرنگترە یان پەیامە پڕ ماناکانی تۆڵستۆی؟ ئایا دارشتنە تۆکمەکەی ئێلیەت بە بەهاترە یان سۆزە مرۆڤدۆستییەکانی تێکستەکانی ئەراگۆن یان نیرۆدا یان و یان؟ تەنانەت لە ئەدەبیاتی عەرەبییشدا ئەو دوانانە هەن: ئایا تێکستە زانستخوازەکانی ئیبن ڕوشد بە نرخترە یان ئەودیوخوازییەکانی غەزالی؟ ئەری لە نێوان ئەدۆنیس و مەحموود دەروێشدا کامەیان براوەیە؟!

سەبارەت بە ئەدەبیاتی کوردی، دەبی ئەوە بڵێم کە شیعری کوردی لە پەنجا ساڵی ڕابردوودا پارسەنگەکەی بەرەو ماناخوازی لاربۆتەوە، شیعری کوردی ئەوەندەی عاتیفە بووە، ئەوەندە ئاوڕی لەوە نەداوەتەوە کە ئەدۆنیس گوتەنی (شیعر کائینێکی زمانەوانییە) کۆڵەگەی عاتیفەش هەمیشە گوتارێکە و ئاراستەی دەرەوە دەکرێت (ئەو عاتیفەیەی پێش زیاتر لە دوو سەد ساڵ، بۆدلێر داوای نەهێشتنی دەکرد وەک کۆڵەگەیەک لە

کۆڵەگەکانی شیعر) لە کاتێکدا شیعر ئاراستەی ناوەوە دەکرێت، ئەمەشە وا دەکات شیعری زاتی یەکسان نەبێت بە شیعری شەخسی. بۆ ئەوەی بتوانم لەم نووسینە کورتەدا ئاڵۆزی نەنوێنم ئەوا ڕاستەوخۆ پێم وایە دیدگای ماناخوازی مەحوییانە (کە شیعر بەرەو گوتارێکی دەستەجەمعی و کۆمەڵگە و دەرەوە و ئەوانیتر دەبا) سەرکەوتووە بەسەر دیدگای نالییانە (کە گرەوی ڕاستینە لەسەر تەکنیک و زمان دەکا وەک ماڵە ئەبەدییەکەی دەق). لێرەوە شاعیرانی ئێمە لە حاجی قادری کۆییەوە تاوەکو ئێستا هێندەی دەبنە ڕۆشنبیر، نیو ئەوەندە نابنە داهێنەر، چونکە شیعر کارێک نییە وەک ڕۆشنبیری بەشدارییەکی چالاکانەی کۆمەڵایەتی بێت، شیعری کوردی بە گشتی و لە پەنجا ساڵی ڕابردوودا زۆر بە دەستی ڕۆشنبیرییەوە ناڵاندوویەتی، شیوعییەکان و قەومییەکان هەمیشە شیعریان بە ئاراستەی ڕۆشنبیریدا بردووە، لە کاتێکدا پێویستە شیعر ئاراستەی ئیستاتیکی وەرگرێت، شیعر چالاکییەکی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو کارێکی فەردانییە و نرخ و بەها لە خۆیەوە وەردەگرێت، لە مێژووی ئێمەدا بەردەوام بەهای شیعر پەیوەست بووە بەوەی چەند سوودی هەیە، شیعر بۆ زەرەر و قازانج دەنووسرا، لە کاتێکدا پارسەنگی شیعرییەت ئەوە نییە، بەڵکو جوانی و ناشرینییە. لە نیو سەدەی ڕابردوودا شاعیری ئێمە چونکە بە پێشەنگی کێشە سیاسی و گرفتە کۆمەڵایەتیاکانەوە بەسترابۆوە، دەبوایە (بیویستبا یان نا) هەر گەشبین بێ، چونکە گەشبینی یەکێکە لە خەسڵەتەکانی کۆڵنەدان (لە کاتێکدا هەموو تێکستە

مەزنەکان دەیسەلمێنن کە کۆڵنەدان بۆ شاعیر لە وەهم بترازی هیچی دیکە نییە). لێرەوە من لەززەت لە تێکستەکانی **رامیار مەحموود** دەکەم، لێرەوە شایەتی بۆ دەدەم کە ئەوەی لە دوو سەد ساڵی رابردوودا لە ئەدەب مایەوە بریتی نییە لەو تێکستانەی گەشبینن، بەڵکو بریتین لە تێکستانەی باس لە بێجەدوایی دەکەن (یەکێتیی سۆڤیەت حەفتا ساڵ و ئیسلامییەکان هەزار و چوار سەد ساڵە) بەرگری لە ئەدەبیاتی جەدوا دەکەن، کەچی لە کولەکەی تەرپشدا ناوی تێکستەکانیان نەما! لەبەر ئەوەی تێکستی کۆمەڵگە و نەتەوە و مێگەل بوون، تێکستی ئینسان نەبوون. شیعر بۆ ئەوە نانووسری (نەتەوە ببێتە دەوڵەت، یان کۆمەڵگە ببێتە خاوەنی قیتار، یان مێگەل بچنە ژێر باری دارعەسای شوانێکی سیاسی). ئەمانە هەمووی قسەی رووتن.. شیعر بۆ ئەوە دەنووسرێ ئینسان ئینسانیتر بێ و بەس. لەگەڵ ئەوەی تێبینیم لەسەر چەند دەقێکی رامیاردا هەیە لەوەی تۆکمە نین و ئەویش کەمێک تەرازووەکەی لارکردۆتەوە بەرەو ماناخوازی، بەڵام شیعرەکانی رامیار ئێجگار ترسناکە شاعیرێک بینووسێت، بە جورئەت بۆ رامیار حسێبە کە قووڵی خۆیمان نیشان دەدا و خۆی لە پەناوپەسیوی یارییە ستکۆکەکانی زمانەوانییەوە ناشارێتەوە، رامیار روونە و لە بینینی تەنکیی ئاوەکەیشی ناسڵەمێتەوە، وشە و رستەکان لیخن و قوراوی ناکات تاوەکو خوێنەر قووڵییەکەی نەزانێت، رامیار پێویستی بە زیرەکیی من نییە لە دۆزینەوەی قووڵیی دیدگا و دنیابینییەکانی، ئەو خۆی لە تێکستەکانیدا بە روونی دان بە تەنکیی ئاوی ژیان

دەنێت (هەموو شاعیرە مەزنەکانیش هەر لە هۆمیرۆسەوە تاوەکو ئەمڕۆ ئەوە دەسەلمێنن)، گرنگترین خاڵ لە شیعرەکان و ئەزموونی ڕامیاردا ئەوەیە مێژووی کورد وەک خۆی دەخوێنێتەوە (کەم کەسم دیوە لە تێکستی کوردیدا بە قەد ڕامیار هەستی بە نیفاقی مێژووی ئێمە کردبێ). منداڵەکانی ئێمە لە مەکتەبدا مێژوویەک دەخوێنن کە دوور و نزیک پەیوەندیی بە ڕاستییەوە نییە (مێژوویەک تیایدا هەموومان پاڵەوانین و بێگەردترین و پاکترین و بێگرفتترین گەل و نەتەوەین)، ئەو مێژووەی کتێبەکانی مەکتەب نە شەڕی براکانی تێدایە و نە خیانەت و نە جاشایەتی (هەموو حزبەکان فریادڕەسن و هەموو سەرکردەکانیش بابانۆئێل) ڕامیار دژی درۆ گەورەکانە، نەیاری مێژووی ئاوەژووە، ڕامیار هاوڕایە لەگەڵ تۆماس سێرنز ئێلیەتدا، لەوەی (مردووەکان بە چاوی ئابڵەقەوە لە جووڵەی بێسوودمان دەڕوانن).



## چیرۆکی کوردی

## گرفتی گرەوکردن لەسەر بابەت

ئایا ئەوەی لە ئەدەبدا دەمێنێتەوە، زمانە یان بابەت؟ ئەم پرسیارە لەمێژینەیە، بەداخەوە بۆ ئێستاش دەشێت، ئیستاش واقیعی ئەدەبی کوردی بە گشتی و چیرۆك بە تایبەتی لە بەوتەقەی هەندێ قەیراندا قەتیس بووە. بۆچی گابریێل گارسیا مارکیز لە یەك دڵۆپەخوێندا ڕۆمانێك دەنووسێت (شوێنەواری خوێنت لەسەر بەفر)؟ کەچی کورد یەك دەریا خوێنی ڕژاوە، نەتوانراوە بکرێتە دوو ڕۆمانی سەرکەوتوو! توانای نووسەر لە هەڵبژاردنی بابەتدا نییە، بەڵکوو لە توانای دارشتندایە، ئەوەی دەق زیندوو دەکات زمانە نەك بابەت، گوێدرێژەکەی نالی زۆر زیندووترە لە زۆربەی ئەو دەقانەی بۆ کێشەی گەورەی نەتەوە نووسراون (وێڕای جیاوازییان لە ناوەڕۆك و مەزنیی کێشەکان). گرەوکردن لەسەر بابەت وەهمی بەدەستهێنانی گەورەیی دەقە.

یەکێك لە دیارترین گرفتەکانی چیرۆکی کوردی ئەوەیە، کە چیرۆکنووس بە هەناسە و ئامرازەکانی شیعر دەنووسێت، چیرۆك پێویستی بە بوونی زانیارییە، پاڵەوانی چیرۆکە کوردییەکان، زۆربەیان یان عارەقخۆرن، یان نیشمانپەروەر! یان لە باشترین حاڵەتدا عاشقن! ئەم سێ پاڵەوانەش لای چیرۆکنووسی کورد دەبێتە دەقێکی بێ زانیاری و دارشتنیشی لە ئیسترسالاتی عاتیفی و سەردیاتی ڕووت تێپەڕ ناکات، چیرۆکنووسی کورد کەی باوەڕی بە مەعجەم هەیە؟ مارکیز زۆربەی سیفەتەکانی دیکتاتۆری ڕۆمانی (پاییزی بەترێرك)ـی لە فیل وەرگرتووە! ڕۆمانی (لە ساتەوەختی شوومدا)ـی سێ جار دڕاندووە، چونکە پێی وابووە پلەی گەرمای ناو ڕۆمانەکە وەك پێویست نییە! کێ

بینویه‌تی پاڵه‌وانی چیرۆکی کوردی باخه‌وان بێت؟ (تا بزانین چیرۆکنووس ناوی چه‌ند دره‌خت ده‌زانێت؟) هه‌موو پاڵه‌وانه‌کان سه‌رقاڵی کرۆژتنی حه‌بی پاراستۆڵ و هه‌ڵقوڕاندنی شرووبی گرانه‌تان! (چیرۆکنووس ناوی سێ حه‌بی دیکه نازانێت!) له ڕۆمانی "سه‌د ساڵ ته‌نیایی"ی مارکیزدا ناوی سه‌دان ڕووه‌ك هاتووه که وه‌ك داوده‌رمانی میللی به کار دێن! جاك له‌نده‌ن له "دان چه‌رمووی"دا هه‌ر ده‌ڵێی هه‌موو ژیانی له‌گه‌ڵ ئاژه‌ڵدا به‌سه‌ر بردووه، چیرۆکنووسی کوردیش کاره‌ساتی نه‌ته‌وه‌که‌ی خۆی پێ ناکرێته ده‌قێکی زیندوو! نووسه‌رێکی وه‌کو ئه‌مبرتۆ ئیکۆ له ڕۆمانی (ناوی گوڵ)دا باس له سه‌ده‌ی دوانزه‌ی میلادی ده‌کا، که هیچ شتێکی ئه‌م سه‌رده‌مه‌ی تێدا نییه، ئیکۆ له‌م ڕۆمانه‌یدا باس له پۆشاك و خواردن و هه‌ڵسوکه‌وتی مرۆڤی ئه‌وکات ده‌کات، سه‌رجه‌م که‌ره‌سه‌کانی ئه‌م سه‌رده‌مه‌ی به که‌ڵك نایه‌ت! له سه‌ده‌ی دوانزه‌مدا نه خواردن وه‌کوو ئێستا بوو نه پۆشاك و نه هه‌ڵسوکه‌وت. له نه‌عله‌وه بیگره تا ده‌گاته سڵاوکردن، له مووکێشه‌وه بگره تا ده‌گاته ته‌عزیه‌دانان جیاوازی هه‌یه، که‌چی هێنده خه‌مخۆری پیشه‌که‌یه‌تی به هه‌موو ورده‌کارییه‌کانه‌وه نووسیویه‌تی! هێنده خه‌مخۆری خوێنده‌وارییه باس له کتێبی (عروج)ـی محێدین بن عه‌ره‌بی ده‌کات، ئه‌وه‌ش نه‌بێت که ڕۆمانه‌که‌ی گێڕانه‌وه‌ی چیرۆکێکی خۆشه‌ویستی، یان نیشتمانپه‌روه‌ری بێت، یان باسی فاشیلێکی عارقخۆر بکات، که که‌ره‌سه‌کانی قسه‌ی ڕووت بن و پێویست به زانیاری نه‌کات! نه‌خێر.. به‌ڵکوو سه‌رجه‌م ڕۆمانه‌که باس له کتێبخانه‌ی کڵێسایه‌ك

دەکـات کە کۆمەڵێـك کەسـی تـایبەت کـاری نووسـینەوە و کۆپیکردنی کتێب ئەنجام دەدەن. واتـا ئیکـۆ پێویسـتە لەسـەری نەك جۆرەکـانی خـواردن و پۆشـاکی سـەدەی دوازدە بزانێـت، بەڵکوو دەبێت بشـزانێت لەو مێـژووە چ کتێبێـك دەرچـووە و چ کتێبێـك دەرنەچـووە! ئیکـۆ خـۆی لە چاوپێکەوتنێکـدا دەڵێـت: (یەکێـك لە کەسـەکانی ڕۆمـانەکە عەینەکـی لە چـاو بـوو، کە گەڕامەوە بۆ مێـژوو زانـیم دوای چـل سـاڵ لەو بەرووارە عەیـنەك پەیـدا بـووە). چیرۆکنووسـی کـورد هەڵوێسـتی خـودای لە پاڵەوانەکانی هەیە و هیچ پەراوێزێك بۆ لێکدانەوەی خوێنەر جێ ناهێڵێت، گرێکان بە ئاسانی دەکرێنەوە و پێویست بە هەڵوەستە و گەڕانەوەی خوێنەر ناکەن. هەمینگوای گوتەنی (چیرۆکـی بـاش وەك چیای سەهۆڵ وایە، سێ بەشی لە ئاودایە و بەشێکی دیارە). چیرۆکی کوردی وەك ئەوەی خـانوو بێـت، پـاش خوێنـدنەوەی چەند پەرەگرافێك، خەریتەکەی لە باخەڵی خوێنەردایە.

بە زمانێکی مات، بەڵام گەرم، لە ڕەزامەندییەوە بەرەو پرسیار و گومـان، لە گەڕانـدنەوەی خەون وەك شـانۆیەکی نـوێ بـۆ پەیوەندیی نێوان ئینسـان و شـتەکانەوە، دلاوەر قەرەداخـی شـیعر دەنووسێ.

لە نیـوەی دووەمـی سـەدەی بیسـتەمدا، ڕووبـارە گەورەکەی شـیعری کـوردی بەرانـبەر بە واقیـع تـاکە ئەلتەرنـاتیڤی بەرگـری بووە، لە کەنار ئەو ڕووبارەدا جۆگەلەی گرنـگ و بەرچـاو هەن (وەك عەبدوللا گۆران)، کە جوانیی سروشـتی وەك ئەلتەرنـاتیڤ پێشـــکەش کـــردووە، بەڵام زۆربەی شـــاعیران لە ڕوانـــگەی ئایـدۆلۆژییەوە لە ئینسـان و شـتەکانیان ڕوانیـوە، دوای گـۆران، هەڵمەت و بێکەس و پەشێویش هەر لە ڕوانـگەی ئایـدۆلۆژییەوە لە ئینسـان و شـتەکانیان ڕوانیـوە، ئەوانـیش بـێجگە لە بەرگـری بەدیلی دیکەیان پـێ نەبـوو. بـۆ نمـوونە لای شـێرکۆ بـێکەس لە کەمترین حاڵەتدا ئینسان دەبینرێت، هەمیشە ئینسـان و شـتەکان لە خزمەتی کۆمەڵگا و نەتەوەدا بەکـار هێنـراون. بـێکەس کـاری بە بەرد هەر ئەوە بوو لە دوژمنی بگرێت، کە ئەمەش سەرەتاییترین پەیوەندییە لە نێوان بەرد و بەکاربردنیـدا، نەدەهـاتە سـەر خـودی بەرد، هـیچ توخمێـك سـەربەخۆ نەبـوو، هەمـوو پاشـکۆی ئەو ئامانجە بـوون کە مانـاکەی دەیخواسـت. بـۆیە دەبینـین نـوخبەی سیاســیی کــوردی هەردەم دڵــی بە شــیعرەکانی کــاك شــێرکۆ دەکرایەوە، چونکە هەمان ئەو گوتارە دەستەجەمعییەی هەبوو کە لە کۆتاییـدا لەگەڵ گوتـاری سیاسـییەکان تـێکەڵ دەبـووەوە بـۆ

تەئجیلکردنی خەونە فەردییەکان. لێرەوە گوتاری شیعریی کاك شێرکۆ لە کۆتاییدا تێکەڵ بە گوتاری دەسەڵات دەبووەوە، دەبووە جۆگەلەیەك بەرەو رووبارە گەورە زانراو و باو و ناسراوەکەی نەدۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤی دیکەی روانین و دنیابینی لە شیعر و ئەدەبیات، رەنگە هەر لەبەر ئەمەیش بێت کەسێك نادۆزیتەوە لە نوخبەی سیاسی کەیفی بە شیعری شاعیرە لاوەکان بێت، قەریحەی بە شیعری تازە نەگیرێت، یەك بە خۆم لە سیاسییەکم نەبیستووە بڵێت حەز بە شیعری تازەی کوردی دەکەم، چونکە شیعرێکە هیی کۆمەڵگا و نەتەوە نییە، شیعری ئینسانە بە هەموو نشێوی و نشوستییەکانی. شیعرێك نییە شەقامیان بۆ تەجمید بکا، شیعرێك نییە تەماهی لەگەڵ ئەو رابردووەیان بکات کە شەرعییەت دەداتە دەستڕۆیشتوویی ئێستایان، شیعرێك نییە بەرگری و پاڵەوانەکانی تەمجید بکا، هەموو کۆمەڵگا بکاتە ئەو مێگەلەی پێویستی بە شوانەکانی بەرگری هەبێت، هەڵمەت و پەشێویش هەروەها، باسی ئەو عەرەبانەیان دەکرد کە پێی دەڵێن نەتەوە، بەڵام ئاوڕیان لەو دەنکە گەنمانە نەدەدایەوە کە لە عەربەناکەوە دەڕژێ، کە بریتی بوون لە مەراقە وردەکانی ئینسان.

لێرەشدا دەرفەتە ئەوەیش بڵێم کە ئەزمووی شیعری هەشتاکانی هەولێریش باجی ئەم دۆخەی دا، ئەوانیش کە تەنیاییان کردە ئەلتەرناتیف بۆ بەرگری، پەراوێز خران.

وەك خوێنەرێك کاتێك هەردوو بەرگی کۆشیعرەکانی دلاوەرم خوێندەوە، سەرنجی سەرەتاییم لەوەوە دەستی پێ کرد

کە نەخۆشـــیەکی درێژخـــایەنی شـــیعری کـــوردیم تیایـــدا بەدی نەکرد، ئەویش هەستی خاوەنداریتیە بۆ هەق و خـاك و خەڵـك، لە زۆربەی ئەزموونەکانـدا شـاعیر دەمڕاسـتی خـاك و خەڵـکە، دەبێـتە پێشـەنگ و قەدەری خـوێنەران، دلاوەر بـێجگە لە خەون ئیـدیعای خاوەنـداریتی هـیچ ناکـات، ئەلتەرناتیڤیشـی بـۆ واقیـع بـریتییە لە خەون، مێـژووی ئەدەبیـاتیش ئەوەی سـەلماندووە کە پەنـجەرەی خەون گرنگتـرە لە دەرگاکـانی ئایـدۆلۆیا. گرنگـی بـوونی کۆشـیعر لەوەدایە خـوێنەر دەتـوانێ هەوراز و نشـێوی ئەزموونەکە ببینێت، لە شیعری ئەم ساڵانەی دواییـدا دلاوەر وەك ئەو شـاعیرە سـۆفییە ناسـکە دوورەپەرێـزە نـامێنێ تەنیـا لە ڕێـی دارشـتنی ڕۆمانسـیانە و زمـانی حەریـرەوە بە شـوێن سـتاتیکای سـپییەوە بگەڕێـت، بەڵکـو شـۆڕ دەبێـتەوە بەرەو دۆزینـەوەی ئەو خەمانەی لە پشت پێکەنینی ئینسانەوە وەستاون، دوزینـەوەی ئەو کونانەی لەو لێفەیەوە هەیە کە هەمووومان بە خۆماندا داوە: زمان.

چەنـد جـوانە شـاعیر وەك نیکـۆس کـازانتزاکیس بزانێـت کە خـۆی نـوێنەری مـوتڵەقی هەق نیـیە، نـوێنەری مـوتڵەقی خـاك و خەڵك نیـیە، بەڵکـو هەڵگـری هەمـوو جیناتەکـانی مرۆڤـایەتییە بە درێژایی مێژووی مرۆڤ، شاعیر خۆی وەك مرۆڤێـك کە کەمتـر لە سەد ساڵ دەژیـێ و خۆیشـی نازانێـت لە کـوێ هـاتووە و بـۆ کوێ دەچێت، لەبەرچی ببێتە واعیز و ئامۆژگـاریکەری مـوتڵەقی هەق؟ لێرەوە ئەو دنیابینیەی دلاوەرم پێ جوانە کە جارێك باوکە و جارێك مناڵ، لە شیعرێکدا دارشـتن ناسـکە و لە شیعرێکیشـدا مانا زبر. ئیتـر هاوسـەرگیری لەگەڵ گومانـدا دەکـا و بە یەکەوە

بیابانەکانی یەقین تەی دەکەن. پەیوەنـدیی دلاوەر بە شـتەکانەوە زانـــراو و وەســـتاو نیـــیە، بەڵکـــو لە شـــێوەی سروشبەخشـــین و وەرگـرتنە، کەم شـیعری کـوردی هەیە هێنـدەی شـیعری دلاوەر بـۆنی تێـــدا بێـــت. لە ڕووبـــارە گەورەکەی شـــیعری کوردیـــدا دیارترین دیاردە دەنگ و هاتوهاوار هەبووە، بە دەنگـی بەرز بـۆ داواکردنـی مـاف پـاڕانەوە لە دنیـا هەبـووە (شـیعری شـێرکۆ و هەڵـمەت و پەشـێو بە نمـوونە) ئەو شـیعرانەیان تەنیـا بـۆ ئەوە دەشێت وەکو دەنگێك ئێمە ببیسـتین، بەڵام شـیعری دلاوەر بـۆ ئەوەیە چاو دابخەیت و بۆن بکەیت، بۆنی منـداڵیمان، بـۆنی ئەو تەمەن و تەمەنایانەی وەکو لم لە نێوان پەنجەکانمـانەوە دەڕژێـن، بۆنی مێخەك و بۆنی خۆڵی دوای یەکەم بارانی پاییز.

لەگەڵ ئەدۆنـــیس هـــاوڕام لەوەی شـــیعر بـــوونەوەرێکی زمانەوانییە، شیعر لای مـن کـارکردنە وەك هەر کـارێکی دیـکە، زۆر باوەڕیشم بە وەحی و ئیلهام نییە، باوەڕم بە زیرەکی هەیە لە دۆزینەوەی خـاڵی هـاوبەش لەنـاو شـتە لێکدژەکانـدا، دەنـا گەر شیعر وەحی و ئیلهام بێ، چۆن هەر دێڕێکی نالی زیاتر لە چوار مەعنای دەبێ؟ نـالی کـاری کـردووە لەنـاو زمانـدا، وەك چۆن زێڕینگەر کار دەکـات لە هۆنینەوەی ملوانکەیەکـدا، شـیعر لای مـن دۆزیـنەوەی پەیوەنـدیی نـوێیە لە نێـوان شـتەکاندا، لە نێـوان توخمەکانـــدا، لە نێـــوان مـــرۆڤ و سرووشـــتدا، دۆزیـــنەوەی دراوســـێتیی نـــوێیە لە نێـــوان وشـــەکاندا، کـــارکردنە لەنـــاو ئەبجەدییەت، هیچ بابەتێك لە شیعردا لە بابەتێکی دیـکە گرنگتـر نییە، بەڵکو ئەوە داڕشتنە وا دەکـات شـیعرێك لە شیعرێکی دی جوانتر بێت، گەر ڕوونتربم، ئەوا هیچ بابەتێکی نوێ بوونی نیـیە، چ بابەتێـك نـوێیە؟ (مـردن، نیشـتیمان، تەنیـایی، خۆشەویسـتی، مرۆڤدۆستی، تـاد) هەموویـان هەزاران شـیعر و سـەدان ڕۆمانیـان لەبـــارەوە نووســـراوە، ئەوەی بـــۆ نـــوێگەری دەمێنێـــتەوە تەنیـــا کارکردنە لەناو زماندا. قسەیەکی باو لەناو شاعیرانی کورد هەیە، دەڵێن ئێمە نازانین شیعر چییە و یەخەمان دەگرێ و دەینووسـین، یـان دەڵـێن ئـێمە شـیعر دەمانووسـێتەوە، بەو مانـایەی شـیعر بە

زەمبیلەیەك دێتە خوارەوە، پێم وایە ئەم قسانە تەنیا قسەی ڕووتن، دەنا بۆ دەبێ شیعر کلیلەکانی نەزاندرێت؟ شیعر لەناو زماندا کار دەکات و زمانیش زانستێکی سەربەخۆیە، بۆ من شیعر هەوڵدانێکە بۆ هێنانەکایەوەی دنیابینیی نوێ، بە هۆی بەریەککەوتنی نوێی نێوان وشەکان، ئەمەش بێگومان بە مەرجی فەراهەمکردنی شیعرییەت، چونکە ئەوەی لە شیعردا گرنگە تەنیا یاریی زمانەوانی نییە، بەڵکو بەرهەمهێنانی شیعرییەتە. شیعر و سێکس زۆر لەیەك دەچن، هەردووکیان پرۆسەیەکن پەشیمانییان بە دواوەیە، لە هەردووکیاندا دەسەبەرکردنی لەزەتی درێژخایەن دەبێتەوە وەهم، پاش خۆونکردن لەناو ئەوی تردا (لە سێکسدا جەستە و لە شیعردا زمان) ئەوا دواتر لووتت دەتەقێ بە چارەنووسی تەنیایی خۆتەوە.

ڕەنگە نووسەر (پێش هەمووان من) شیعری مەزن نەنووسێت، بەڵام مەرجە شیعری مەزن بناسێتەوە، بزانێت ئەو خۆڵە کامەیە کە نووسەری مەزن دروست دەکا، ئۆکتافیۆ پاز تێڕوانینێکی جوانی هەیە کە پێی وایە (شیعری مەزن ئەوەیە وا لە خوێنەر بکا، حەز بکا ببێ بە شاعیر)، بەردەوام هەوڵ دەدەم لە تەنیشت خوێنەرەوە بم، خوێنەری ئێمە زۆر پەست دەبێ کە هەست بکا نووسەر خوێندەواریی پێ دەفرۆشێ، یان بە گەمژەی دەزانێت، چونکە ئەم خوێندەواریفرۆشتنەی نووسەران، لە مێژووی

ئەدەبیاتی ئێمەدا بەڵایەکی گەورە بووە. بیرمە لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا، هەموو شیعرێك دەبوایە کۆمەڵێ ناو و سومبولی تێدابا، (مەم، لاس، کەو، ئەسپ، زیفاگۆ، گیڤارا، ئیسماعیلی هێرمان مێرڤل، ئیسماعیلی برای ئیسحاق، خانی لەپزێڕین و سەدان ناو و سومبولی دیکە...). ئەم خوێندەواریفرۆشتنە وای کردبوو تێکستی شیعری لەگەڵ خوتبەی هەینی فەرقێکی نەبێ، بێجگە لەوەی خوتبەی هەینی بۆ خودای موسڵمانان بوو، خوتبەی شیعرییش بۆ خودای ئەغریقییەکان. پێم وایە نووسەر، خوێنەرەکەی دەدۆڕێنێ گەر ئەو هەستەی پێ بدا نەخوێندەوارە و پێویستە خوێندەوارتر بێ، نووسەر ئەو کاتە خوێنەرەکەی دەباتەوە، گەر ئەو هەستەی پێ بدا ئینسانە و پێویستە ئینسانیتر بێ.

گرنگترین شت بۆ شاعیر ئەوەیە نابێت دەستی کەشف بێت، نابێ پێرە زمانەوانییەکانی کەشف بن، چونکە لە هەموو یارییەکدا دەستکەشفبوون یەکسانە بە دۆڕان، لە شیعریشدا وایە، خوێنەر دەستی هەر نووسەرێك کەشف بکات، ئەوا یەکسانە بە دۆڕانی نووسەر. بۆ ئەوەی بخوێنرێیتەوە، دەبێ تەوەقوعی خوێنەر تێپەڕێنیت. نازانم لە کوێم خوێندووەتەوە کە دەڵێ نووسەری باش بەوە ناناسرێتەوە چەندی بڵاو کردووەتەوە، بەڵکو بەوە دەناسرێتەوە چەندی دڕاندووە. نووسەری باش هەردەم

دەبێ ئەو دێڕە شیعرە نایابەی ئۆکتافیۆ پاز داگیری بکا کە دەڵێ (ژیان کەی هی من بووە؟ ژیان هەمیشە هی ئەوانی ترە، کە ئێمەین..)




# گـــابـــۆ

## ئەوەی لەبری هەموومان نووسی

گابریێل گارسیا مارکیز، ڕۆمانەکانی بۆ زیاتر لە پەنجا زمان وەرگێڕدراون کە بەناوبانگترینیان ڕۆمانی "سەدساڵ تەنیایی"ـیە و تیایدا مێژووی کۆلۆمبیا و ئەمەریکای لاتین و مرۆڤایەتی کورت کردووەتەوە، سەرەتای ژیانی ئەدەبیی خۆی بە ڕۆژنامەنووسی دەست پێ کردووە و دواتر ڕووی کردووەتە چیرۆك و ڕۆمان، زیاتر لە پازدە ساڵ سیناریۆی فیلمی نووسیوە و بەشدارییەکی بەرچاوی هەبووە لە پەرەپێدانی فیلم و فیلمسازی لە ئەمەریکای لاتیندا، سەدان وتاری هەیە لەبارەی چۆنیەتی نووسینی سیناریۆی فیلمەوە، بۆ ماوەی زیاتر لە ٤٠ ساڵ، مارکیز ڕەتکردنەوەی بە فیلمکردنی ڕۆمانەکانی بۆ هۆکارێك دەگێڕایەوە، کاتێ هەمیشە ڕایدەگەیاند کە ڕوخساری پاڵەوانی فیلمەکان، خەیاڵی خوێنەری ڕۆمانەکانم لەناو دەبەن، هەمیشە دەیگوت: وەرن ڕۆمانی زۆربای نیکۆس کازانتزاکیس بخوێننەوە، یەکسەر و بەشێوەیەکی بەردەوام لە کاتی خوێندنەوەی ڕۆمانەکەدا، ڕوخساری "ئەنتۆنی کوین"تان لەبەرچاوە، کە لە فیلمی "زۆربا"دا ڕۆڵەکە دەبینێت، ناکرێت ڕۆماننووس ڕێگە بە کوشتن و بەرتەسککردنەوەی خەیاڵی خوێنەرەکانی بدات، من دەمەوێت هەر یەکێك ڕۆمانێکی من بخوێنێتەوە، بە ئارەزووی خەیاڵی خۆی ڕوخساری کەسەکانی ڕۆمانەکە وێنا بکات، نەك کەسایەتی و فۆرمی پاڵەوانی ڕۆمانەکانم یەکسان بن بە کەسایەتی و فۆرمی ئەکتەرێکی دیاریکراو، ئەمە وێڕای ئەوەی کە فیلم و سیناریۆکان ناتوانن ئەو واقیعە ئەفسووناوییەی ڕۆمانەکان وەك

خۆی بگوازنەوە، ئەوەی لە ڕۆمانەکانمدا بە سیحر دەچێت، لە فیلمدا وەکوو درۆی لێ دێت، جیاوازیی نێوان سیحر و درۆش، جیاوازیی نێوان ڕاستی و مەنتیقە. لە وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەشدا کە باسیان لە گرنگیی سینەما دەکرد بۆ ناساندنی بەرهەمەکانی هەر نووسەرێك، مارکیز دەیگوت: کەس هێندەی من گرنگیی کامێرا نازانێت و زۆر حەزیشم لە سینەمایە و چەندین ساڵی تەمەنیشم بۆ سینەما تەرخان کردووە و دەیەها سیناریۆی فیلمم نووسیوە، بەڵام لە خۆشەیستیی خوێنەرەکانم ئەم هەڵوێستەم وەرگرتووە، چونکە سروشتی ڕۆمانەکانم وا دەخوازێت.

پێش ئەوەی مارکیز لە ڕێی ڕۆمانی "سەدساڵ تەنیایی"یەوە لە جیهاندا بناسرێت، چەندین چیرۆك و ڕۆمانی دیکەی بڵاو کردبووەوە و چەند خەڵاتێکیشی لەسەر ئاستی ناوخۆی کۆلۆمبیا وەرگرتبوو، لەوانە ڕۆمانەکانی "کەس نییە نامە بۆ کۆلۆنێل بنێرێت" و "لە ساتەوەختی شووم" و "چیرۆکی مردنێکی ئاشکرا" و "چیرۆکی دەریاوانە خنکاوەکە" و چەندین ڕۆمانی تر. ئەوانەی ئەم ڕۆمانانە دەخوێننەوە، دەزانن هەر هەموویان دواتر دەبنە بەشێك لە بەشەکانی ڕۆمانی "سەدساڵ تەنیایی"، کە بە یەکێك لە ناودارترین ڕۆمانەکانی سەدەی بیستەم دادەنرێت و مارکیز دەڵێت لە منداڵیدا ویستوویەتی ئەم ڕۆمانە بنووسێت لەژێر ناوی "ماڵ"دا، بەڵام بۆ ماوەی زیاتر لە ٣٠ ساڵ لە ناخیدا ماوەتەوە، چونکە نەیدەزانی بە چ زمانێك و بە چ شێوازێك چیرۆکەکە بگێڕێتەوە، تا دواتر و لە چرکەیەکدا بە خەیاڵی هاتووە کە

پێویسته بەو شێوازەی داپیرەی لە منداڵیدا چیرۆکی بۆ گێڕاوەتەوە، ڕۆمانەکە بنووسێت، بۆیە دەبینین هەموو ڕۆمانەکانی پێشتری هەوڵێك بوون بۆ نووسینەوەی "سەدساڵ تەنیایی." لەوێوە مارکیز دەبێتە خاوەن و ڕێبەری شێوازی ڕیالیزمی سیحری، کە شێوازێکی تایبەتە لە فەنتازیا و هێشتنەوەی دەزوویێکی باریکە لە نێوان خەیاڵ و واقیع، لەم شێوازەدا هەموو داڕشتنێك ڕەوایە بە مەرجێك خوێنەر بە درۆی تێنەگات، مارکیز وێڕای ئەوەی لە ڕۆمانەکانیدا ژنێك لە باخچەکەیاندا بە چەرچەفێك دەفڕێت و دەریا بە شەمەندەفەر دەگوازرێتەوە "وەك چۆن لە ڕۆمانی پایسزی پەترياركدا هاتووە"، کەچی سووره لەسەر ئەوەی کە لە هەموو ژیانیدا دێڕێکی نەنووسیوە واقیعی نەبوویێت! ئەم فەنتازیای داڕشتنە و ئەم سیحرەی لە ڕۆمانەکانیدایە وا دەکات بە ئەستەم بگوازرێتەوە سەر شاشەی سینەما، بەبێ ئەوەی بینەر بە فیلمێکی فەنتازی نەزانێت، مارکیز خۆی زۆر خۆشی بە فەنتازیا نایەت و دەڵێت: پێویسته نووسەر دەزووی واقیع لەگەڵ خوێنەردا نەپچڕێنێت.

ئەوانەی گرنگی دەدەنە هەواڵەکانی مارکیز، دەزانن کە ماوەی چەندین ساڵ وەرشەیەکی کاری هاوبەشی هەبوو بۆ چیرۆك و نۆڤلێت، کە تیایدا لەگەڵ دەیەها چیرۆکنووسی لاو بەیەکەوە چیرۆکیان بەرهەم دەهێنا و بلاویان دەکردەوە، بیرۆکەیەك دەهێنن و بە هەموویان بیر لە پەرەپێدانی دەکەنەوە و دواتر یەکێك لەو لاوانە دایدەڕێژێتە سەر کاغەز و دەسکاری دەکەن و دواتر مارکیز بە داڕشتنی کۆتاییدا دەچێتەوە, بەڵام ئەم

وەرشەی کارە لە ماوەی چەند ساڵێك لەلایەن مارکیزەوە گۆڕرا بۆ وەرشەی نووسینەوەی سیناریۆی تەلەفزیۆنی و سینەمایی، لە کتێبێکدا بە ناوی "چۆن چیرۆك دەگێڕیتەوە؟"دا هەموو ئەو گفتوگۆ و مشتومڕانەی وەرشەکە بڵاو کراوەتەوە، کە تیایدا دەردەکەوێت مارکیز چەندە هۆگری سینەما و فیلمە. مارکیز خۆی لە سەرەتای گفتوگۆکانی وەرشەکە ڕوونی دەکاتەوە و دەڵێت، ڕۆژێکیان لە یەکێك لە تەلەفزیۆنەکانی ئیسپانیدا پەیوەندییان پێوە کردم و داوای نووسینی سێزدە سیناریۆی تەلەفزیۆنییان لێ کردم، بە مەرجێك چیرۆکەکانیش بیرۆکەی خۆم بن، سەرەتا تووڕە بووم و گوتم خۆ من بەرگدروو نیم تا قوماشم بۆ بێنن، کەچی خاوەنی تەلەفزیۆنەکە بە هێمنییەوە گوتی: تۆ هەر وەرشەی چیرۆکت هەیە، بۆچی ئەو چیرۆکانەی وەرشەکەت ناکەیتە سیناریۆش، یەکسەر ڕەزامەندیم دەربڕی و بە کارێکی باشم زانی، کوڕەکانیشم گوتیان تۆ هەر گلەیی لە سینەما و تەلەفزیۆن دەکەیت، کەواتە هونەری خۆت بنوێنە و با بزانین تۆ چۆن کارەکان دەکەیت، نایشارمەوەش کە حەزی کۆنی سیناریۆنووسین هێشتا لە کونجێکی ناخمدا مابوو، ئەوەبوو دەستم دایە پێکهێنانی ئەم وەرشەیە و لەگەڵ گەنجەکاندا واقیعی پیری خۆم لەبیر کرد و لە وەهمی لەشساغیدا دەژیم.

ڕەخنەگرانی ئەدەبی پێیان وایە کە مارکیز هەموو چەمکە گرنگەکانی ژیانی مرۆڤی دارشتووە و لە بۆتەقەی داهێناندا تێکەڵی کیمیای بەهرەی کردووە و داهێنانی لێ هەڵێنجاون.

سەبارەت بە ڕۆمانی "خۆشەویستی لە سەردەمی کۆلێرا"دا

ماركیز دەڵێت كە چیرۆكەكە لە خۆشەویستیی دایكی و باوكی هەڵێنجراوە، بێگومان بە ئاوێتەكردنی ئەزموونەكانی خۆیشی، ئەم ڕۆمانە بە یەكێك لەو ڕۆمانە سەركەوتووانە دەژمێرێت كە تیایدا چیرۆكی خۆشەویستییەكی ڕاستەقینە دەگێڕێتەوە. لە وەڵامی ئەو پرسیارەی كە بۆچی ماركیز ڕێگەی بە فیلمكردنی ئەم ڕۆمانەی داوە، دەڵێت: ئەم ڕۆمانەم بە جیا لەوانی دیكە دەتوانرێت بچێتە ناو چوارچێوەی سیناریۆوە، چونكە پەیوەستە بە حاڵە مرۆییە ڕوونەكانەوە، دەكرێت سینەماش بەشدار بێت لەو هەڵمەتە ئەدەبییەی دەیەوێت بیسەلمێنێت كە دنیا وێڕای پەتاكان، وێڕای ماڵوێرانییەكان، وێڕای ئاژاوەكان، هێشتا بە كەڵكی بەرهەمهێنانی جوانی و خۆشەویستییش دێت.



## ئـەنـوەر مـەسـیـفی

**دەرچوون لە سووڕی نووسین، چوونە ناو سووڕی مانا**

سەرەتای نووسین دەربارەی ئەوانەی بە یەکجارەکی جێمان دێڵن ئەستەم و دژوارە، خۆشحاڵم بەوەی بەم دێڕەی پێشەوە سەرەتای ئەم نووسینەم تێپەڕاند. عادەتەن ئەم جۆرە نووسینانە مۆرکێکی زێدەڕۆیی و عاتیفی لەخۆ دەگرن! موحافیزکارانە دەنووسرێن! بەڵام من لێرەدا ئەو ئازادی زمانە دەدەمە خۆم کە **ئەنوەر مەسیفی** هەموو ئەزموونی شیعریی خۆی بۆ تەرخان کرد و ساڵەهای ساڵ خەونی پێوە دەبینی و بە هۆیەوە دووچاری دەسخۆشی و تەشەری ئاشنا و بێگانە بوو! سەیرە... هەولێرییەکان لە زۆربەی بوارەکانی ژیاندا هێمن و موحافیزکارن! بە تەنیا لە شیعر نەبێت: چەتوون و نوێخوازن. شاعیرانی هەولێر زۆربەیان سەعات یازدە و نیوی پێش نیوەڕۆ بیانبینە کەسی عادین و ئامادەن گەرمترین گفتوگۆ لە بارەی باشی و خراپیی برنجی بایەع و شتەکانی دیکەی ژیانی ڕۆژانە دامەزرێنن! کەچی کە ئێوارە داهات تەقسی ئەفراندنیان دەست پێ دەکات، باپیرانیان: نالی و بۆدلێر زیندوو دەبنەوە! وەك ئەوەی تۆڵەسەندن بێت لە ڕۆژیان، شەو پڕ دەکەن لە بۆن و بەرامەی ئاڵەت و بەهاراتی نوێخوازی. هەریەکە و لە کونجێکی ماڵەکەیدا کە دیوارێکی نێوانە لەگەڵ ئەو دراوسێیانەی (سەریان بچێ... نوێژیان ناچێ)، هەرچی کۆت و پێوەندی زمان هەیە وردوخاشی دەکەن! بەم خەسڵەتەشە سەرفراز و نوێخوازن، لۆکاڵ و ناوچەیی نین. هەولێر لە سەنحارییەوە تا دەگاتە (ڕۆستەم باجەلان) هەروا بووە، شاعیرانی لە ڕۆژدا پۆشتەوپەرداخن، چەشنی بۆدلێر کە نەیدەویست دەوروبەری بچووکترین دەرفەتی ڕەخنەگرتنیان بۆ

بڕەخسێت! بەڵام لە شەودا یاخی دەبن و گرێبەستیان لەگەڵ کۆمەڵگە جیڕ بە جیڕ دەکەن. وزەی ئەو ساوارەی نیوەڕۆیان نۆشی دەکەن، ئێواران بە سەمایەکی باخۆسییانە هەزمی دەکەن! بۆ شاعیران ڕۆژی هەولێر زۆر سەختە! هیچ نەیکوشتووم ئەو تەسبیحە بنێشتانە نەبێ کە هەندێ لە شاعیران ڕێوڕەسمی ئینتیما کۆمەڵایەتییەکانی پێ تەواو دەکەن! خۆشبەختانە چەندین تەسبیحی بنێشت و سەدەف و بەرەدار و قەزوانم دیوە شەوان هاشم سەڕاجی شاعیر پچڕاندوویەتی و بە سرووشێکی زناکییانە هەوای داوە.

لەم جەنجاڵی و لێکدژییە سوورریالی و ئەستەمانەی نێوان: کاسبی و شیعر، شاعیر و ئەوانی تر، تەسبیح و خەیاڵ، بایەع و بەهرە، ئیتر ژیان بە گشتی، ئەنوەر مەسیفی شاعیرێکی تا سەر ئێسقان نوێخوازە، چونکە ئەگەر شاعیرانی هاوەڵی کاریان بۆ ئەوە کردبێت لە ئەزموونی شیعریی خۆیاندا مامەڵەی تازە لەگەڵ مانادا بکەن و بەرەو ئاقاری دیکەی فۆرمی شیعر بڕۆن، ئەوا مەسیفی لە قۆناغێکی شیعریی خۆیدا هەر باوەڕی بە مانا نەما! بە شێوەیەکی سادە دیارترین خەسڵەتی مەسیفی لە شیعردا خۆی لە (جورئەت) دەبینێتەوە. ئیتر دەستی لەوە شۆرد هەمبانەبۆرینەی هەژار موکریانی ببێتە سەرچاوەی ڕستە شیعرییەکان، لای ئەو فۆرمخوازی گەیشتە ڕادەی زمانپەرستی، لە شیعردا فۆرم و زمان تەمەندرێژترن لە بابەت، چونکە گرەوکردن لەسەر بابەتی مەزن و پیرۆز بە مەبەستی بەرهەمهێنانی دەقی مەزن بەبێ بوونی فۆرم و زمانی شیعریی نوێ داهێنانی لێ ناکەوێتەوە. مەسیفی

دەیویست بگاتە شیعری موجرەد و ڕووت، لای ئەو عەقڵی مرۆڤ مانا دەبەخشێتە دیاردە و شتەکان (عەقڵ: کە دوژمنێکی مێژوویی و ئەزەلیی شیعرە) لای ئەو ماناکان بەرهەمی عەقڵن کە بەرائەتە بەراییەکانی شتەکان دەشێوێنن. دەنا ڕەنگی نارنجی مانای چییە؟ هیچ و جوانیشە! خۆڵ مانای چییە؟ هیچ و جوانیشە. کەواتە شاعیر دەبێتەوە ئەو منداڵەی کە عەقڵ زاڵ نییە بەسەر دەستهاویشتنەکانی، جا ئاو بێ یا ئاگر. شاعیر چەشنی منداڵ عەقڵ نابێتە قەپانی ماناکانی. شیعرەکانی مەسیفی گەڕانەوەیە بۆ ئەوپەڕی منداڵی، گەر شاعیرانی تر شیعرەکانیان گەڕاندنەوەی بەشێك لە بەرائەتی منداڵییان بێت، ئەوا مەسیفی جورئەتی ئەوەی هەیە خودی دەقی شیعر بکاتەوە گغەگغی منداڵان! لێرەوە شیعر دەبێتە وێنەکێشان، وشەکان دەبن بە ڕەنگ. بەڵام کام وێنە و ڕەنگ؟ نەك ئەو تابلۆ ڕیالیزمییانەی کەللەسەر و پۆستاڵ و تەلبەند و جەمەدانی تێدایە! بەڵکو ئەو وێنە و تابلۆیانەی منداڵە هەترەشچووەکانی بەرایی مێژوو لە ئەشکەوتەکان دەیانکێشا، ئەو منداڵانەی بەوپەڕی دڵسافییەوە، بە گرنگیدانێکی تا ڕادەی تۆقین وێنەی مامزێکیان دەکێشا تا ماڵی بکەن، نەوەکا ئەو مامزە خواوەند بێت و تۆفانییان بۆ بنێرێت! شیعر لای مەسیفی هێندە گەورە و پیرۆز بوو تا ئەو ڕادەیەی هەندێ جار زمانی شیعری لە سادەترین ئەرك دادەبڕێ کە ئامرازی گەیاندن بێت. لای مەسیفی تورهەڵدانی مانا و دژایەتیکردنی مانا، پێشینە و شەرعییەتێکی مێژوویی هەیە، کۆمەڵی کوردی هێندەی قەرزاری شیعرە، قەرزاری هیچ ژانرێکی دیکەی ئەدەبی و هونەری نییە،

بەڵام ئەم دەسکەوتە سۆسیۆ-سیاسییە گەورەترین نەهامەتی بەسەر شیعری کوردی هێناوە! چونکە شیعری کوردی هەمیشە بە بابەت بارکراوە: ئەحمەدی خانی بە شیعر داوای پێویستیی یەکێتیی ڕیزەکانی گەلی کردووە! حاجی قادر بە شیعر داوای سەقافە و سەحافەی کردووە! حەمدی بە شیعر ئامۆژگاریی شێخ مەحموودی کردووە! فایەق بێکەس بە شیعر داوای پەچەلادان و شەمەندەفەری کردووە! شێرکۆ بێکەس بە شیعر داوای هەڵوێستی سیاسی لە ئەدیبان و هونەرمەندان کردووە! عەبدوڵلا پەشێو بە شیعر سەرکۆنەی حزبەکان و سیاسییەکانی کردووە! ئیتر بە شیعر داوای هەموو شتێك کراوە! هانی وەرزشکاران دراوە! داوا لە شارەوانی کراوە نرخی باینجان دابشکێنێ! هەر هەموویشی بە شیعر و بە شیعر و بە شیعر! من خۆ دەزانم ئەو شاعیرە ناودار و بە حورمەتانەی سەرەوە هەریەکە و لە قۆناغی خۆیدا ڕەنگە ئەرکێکی نیشتمانی و نەتەوەیی ئێجگار پیرۆز و گەورەیان ئەنجام دابێت و شایەنی ئەوپەڕی ڕێز و تەقدیرن، بەڵام من قسەم لەسەر ئیشکالییەتەکانی شیعرە، چونکە کە شاعیر ڕۆڵی مێژوونووسێك ببینێ و بە شیعر ڕووداوێك تۆمار دەکات، لەبەر بوونی خەیاڵ وەك ڕوکنێك لە ئەرکانەکانی شیعر، ئەوا نە تۆماری ڕووتی ڕووداوەکەمان دەست دەکەوێت و نە شیعرەکەش.




**مەحموود دەروێش..**

**فـــڕیـــن لە دەرەوەی پـــۆلـــدا**

(١)

هەندێ کەس لە دایک دەبن و دەگوزەرێن و دواتر دەمرن.

هەندی کەس لە دایک دەبن و لە ژیاندا تێ دەکۆشن و دواتر دەمرن.

هەندی کەسیش لە دایک دەبن و داهێنان دەکەن و دواتر: مردن دەرەقەتیان نایەت... مەحموود دەرویش لەم جۆرە کەسانەیە.

بێگومان ژیانی هەموو کەسێك پیرۆزە و مردنی هەر کەسێکیش داهێنەر بێت یان نا، شایەنی پەژارە و بەزەییە، بەڵام مردنی مەحموود دەروێش لە پەژارە و بەزەیی گەورەترە، شایەنی لەسەر وەستان و دەرس لێ وەرگرتنە. لەم دەرفەتە کورتەدا نەمویست باس لە ژیان و ڕیزکردنی بەرهەمەکانی شاعیر و ڕێوڕەسمی مردنەکەی بکەم، بە باشیشم نەزانی سەری خوێنەر بە قۆناغە ئەدەبییەکانی بێشێنم، ئەمانەی پێشوو هەر هەمووی بە زیادەوە خوێنەر دەتوانێت بە گەڕانێکی چەند چرکەیی لە گوگڵ دەستی بکەوێت و هیچ منەتێکی ئێمەمانان هەڵنەگرێت، ئەوە گرنگە بتوانین ئاوڕێکی خێراش بێت لە شیعر و بەرهەمی ئەو ناوە گەورە شیعرییە بدەینەوە بە مەبەستی ئەنجامدانی بەراوردێك لە نێوان ئەو و خۆماندا، هەوڵ بدەین خاڵە بەهێزەکانی دنیابینی دەروێش بزانین و سوودی لێ وەرگرین، بە تایبەتی ئەو، چونکە دنیابینی و بەرهەمەکانی ڕەنگدانەوەی کۆمەڵە مرۆڤێکە کە ڕوخساریان لە ڕووی مێژووییەوە زۆر لە ڕوخساری ئێمە دەچێت.

(٢)

له دنیابینی و بەرهەمە ئەدەبییەکانی ئەم شاعیرەدا دەتوانرێت چەندین پەند و وانە بچنرێتەوە. بە تایبەتی بۆ ئەدەبیاتی ئێمە، کە لە ڕووی بونیادی بابەتییەوە زۆر لە ئەدەبی گەلەکەی مەحموود دەرویشەوە نزیکە. ئەدەبیاتی ئێمەش (بە تایبەتی شیعر) لە چەشنی ئەدەبی عەرەبی بە گشتی و ئەدەبیاتی فەلەستینییەکان بە تایبەتی، گیرۆدەی ئایدۆلۆژیا و هەستی نەتەوەیی و نانەتەوەیی و شەڕی زڕبراکان و شیعری بۆنەکان و شاعیری حزب و گرووپ و تاقم بووە! هەر بۆیەشە دەبینین کورد هەموویان شاعیرن و کەسیشیان شاعیر نیین (کەمێکیان نەبێ کە بە پەنجەی چوار دەست دەژمێردرێن). مامۆستا و شاعیری گەورە هێمن موکریانی پێی وایە ئەگەر دوو کورد پیاسە بکەن سێیان شاعیرە، من هاوڕا نیم لە گەڵیدا و پێم وایە کورد یەکێکە لەو میللەتانەی کە لە ئێستادا شاعیری ڕاستەقینەی زۆر کەمە. بەڵێ هەزاران شیعرنووس هەن کە شیعر بەکار دەهێنن بۆ هەزاران شت، ئەوەی حەز لە یەکێك بکات پڕی دەکات لە (نەورەس و عەشق و غرووب و هەیام و شەوی یەلدا) شیعر نانووسێ، بەڵکو بەکاری دەهێنێ و دەیکاتە ئامراز بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی نائیستاتیکی! ئەوەی دژی دەسەڵاتە پڕی دەکات لە (کوفر و تابووت و خۆڵەمێش و گڵۆپی ماڵە مەسئوولان و نەبوونی خزمەتگوزاری کارەبا و خوێن و نرخی پەتاتە)، شیعر نانووسێ، بەڵکو دەیکاتە پردێك بۆ دەربڕینی دنیابینییەکی سیاسی! بێگومان بەرامبەر بەو شیعرە

ئۆپۆزۆسیۆنییە، شیعری پیاهەڵدانیشمان هەیە لەسەر مەسئول و حزب، چەشنی ئەوەی لە ئەدەبیاتی ڕۆمانیا و یەکێتی شوورەوی (یان شوورەیی، فەرق ناکا) و ئەلمانیای ڕۆژهەلاتیی پەنجا و شەستەکانی سەدەی ڕابردوو هەبوون! ئەوەی هەندێك ئەفکاری فەلسەفییانەی پێیە، پڕی دەکات لە (حەقیقەت و جەهەنەم و نوور و تاریکی و وڕێنەکانی شتراوس و بە نیتشە دەڵێ نیچە) مەبەستی نووسینی شیعری نییە، بەڵکو شیعر دەکاتە دەفتەری تاقیکردنەوە و خوێنەریش لەسەریەتی نمرەی ڕۆشەنبیری بداتێ.! لای ئێمە هێندەی لە شیعردا بیر لە ئاخنینی ئەفکار دەکرێتەوە، بیر لە بەرهەمهێنانی شیعرییەت ناکرێتەوە. لێرەوە شیعر لە گوتارێکی ئێستاتیکی دەگۆڕێت بۆ نواندنی هەڵوێستێك بەرامبەر بە واقیع، لە پرۆژەیەکی خەیاڵەوە دەبێتە جووینەوەی ناسراو و زانراوی واقیع. من نامەوێت بڵێم کە شیعر پەیوەندی بە واقیع و ئایدۆلۆژیاوە نییە، بەڵکو دەمەوێت ئەوە بدرکێنم کە شیعر واقیع و ئایدۆلۆژیا لە خۆ دەگرێت نەك بە پێچەوانەوە. شیعر خزمەتکاری ئایدۆلۆژیا نییە دەنا دەبوایە شیعری ئایینی باشترین و جوانترین دەق بوایە. شیعر ئاگاییە بەرامبەر بە جوانی، نەك بەکارهێنانی بۆ بەپاڵەوانکردنی کەسێك. لێرەوە دەمەوێت بە قەناعەتی خۆم قسەیەك لەسەر سەرچاوە و هاوکێشەی ئەو دەرەنجامە شیعرییە بکەم کە ئێمە ئێستا دوچاری بووین، یەکێك لەو هۆکارانەی شیعرنووسینی لای ئێمە ئاسان کردووە و هەمووانی کردۆتە شاعیر، بە هەڵەتێگەیشتنمانە لە کۆڵەگەیەکی

سەرەکی شیعر کە ئەویش خلیسکان و لادانە لە زمان. شیعر جیاواز لە خامی زمان و قسەکردن دەتوانێت بێ گوێدانە لۆژیك، زمان بەرەو ئاقاری دیکە ببات، لە شیعردا دەتوانیت بڵێیت (هەڵمەکەم جاوی، بەردەکەم فڕ کرد، ئێوارەم خواردەوە..). ئەم خاسیەتە بەرز و دەگمەنەی شیعر لە جیاتی ئەوەی سەرمایەیەکی ئیستاتیکی گەورە بێت، لای شیعرنووسانی ئێمە بۆتە بەڵایەکی گەورە! زانینی هەندێ یاریی زمانەوانی و خوێندەوەی کۆمەڵێك تێکستی شیعری، کافییە بۆ ڕیزکرنی وشە و نووسین لە شێوەی شیعر. هۆکارێکی تر پێم وایە بۆ کولتووری چل ساڵی ڕابردوومان دەگەڕێتەوە لە نووسینی شیعر، لەو ڕابردووەدا شیعر ماڵی سەربەخۆی نەبووە، هەمیشە میوان و خزمەتکار بووە لای چەپەکان و قەومییەکان، چەکێك بووە لە چەکەکان بۆ بەرگری و هێرش و هێرشی پێچەوانەی سیاسی، شیعر ئامرازی دروستکردنی دووانەی خائین و پاڵەوان بوو، لەو مێژووەدا وەکو ئێستا، شیعرە جوانەکان جۆگەلەی تەریك بوون لە چاو دەریای شیعرە ناشیعرییەکان! ونبوونی تاك لەناو عەشیرەت و حزب و ئایدۆلۆژیادا، شیعری مێگەلاوی لێ کەوتەوە، شیعر ببووە پێناسەی ونبوونی فەردانییەت لە مێگەلدا، ئەو کاتەی شیعر بەشدار بێت لە دروستکردنی ئیجماعی سیاسییانەی خەڵك بەرامبەر بە سیاسییەك یان حزبێك، ئەمە نەك هەر کارەساتە، بەڵکو شۆڤینییەتی شیعریی بەرهەم دێنێت! شیعر بەردێك نییە بهاویژرێت، گوڵێکیش نییە پێشکەش بکرێت! بەڵکو

شۆڕشە دژی زمان و مانا، لە شیعردا پێش ئەوەی زمان مانای نوێ دروست بکات، خودی زمان تازە دەکرێتەوە، پەیوەندی تازە لە نێوان شتە لێکدژەکان دەدۆزرێتەوە، شیعرییەت لە دۆستایەتی نێوان پێچەوانەکاندا دێتەکایەوە.

(٣)

من لە سەرەتاکانی خوێندنەوەم بۆ شیعر، کاتێك لە کۆتایی ساڵانی هەشتاکاندا مەحموود دەروێشم خوێندەوە، نایشارمەوە کە بە گومانێکی زۆرەوە لە بارەی گەورەیی شاعیربوونی سەیرم دەکرد، دەمزانی زۆرێك لە ئەدیبان بە هۆی هۆکاری دەرەکی و نائەدەبیی گەورە دەکرێن، ئەم پەتایەی ئەدەب مێژوویێکی درێژی هەیە، چەندین ڕۆمان لەوانە پێم وایە (ئۆلیڤەر تویست یان کاتژمێر بیست و پێنج و.. هی تریش ) دەزگا گەورەکانی دنیا بە بۆنەی لایەنگیری سامییەت و دژایەتیکردنی نازییەت گەورەیان کرد! لای خۆشمان ئەدیب هەبووە ئامێری ئیعلامی گەورەی حزبی لە پشت بووە و گەورە کراوە، چەشنی ئامێری پەشمەك فوو لە قەترەیەك کراوە و کراوەتە بارستاییەك کە منداڵە خوێنەوارەکان بە دەمی کراوەوە سەیری بکەن و سەریان بسوڕمێ! ئەو ئەدیبانە نرخیان لە نرخی ئەدەبییەوە نایەت، بەڵکو لەو چاوبەستانە سیاسییە وەهمی گەورەبوون دەسەبەر دەکەن! بەرامبەر بە گەورەیی مەحموود دەروێش هەمان ترسم هەبوو، گومانم دەکرد ئامێری نەتەوەپەرستەکانی عەرەب بیانەوێت کڵاوێکی شیعریم پێ بفرۆشن! ئەوسا پێشم وابوو ئەم جۆرە

شاعیرانه، شاعیری قۆناغی مێژووین و له ئاژاوەدا نەبێت شیعریان ناژیێت! به تایبەتی ئەو کاتەی بەراوردم دەکرد لەگەڵ نووسینەکانی کۆڵن ویلسۆن دەربارەی ئەدەبی جەمالی و شیعرەکانی ئەدۆنیس که شیعر بوون له سەرووی هۆز و نەتەوە. لەو سەردەمەشدا دەروێش له گەرمەی کاری سیاسیدا بوو لەگەڵ بزووتنەوەی فەڵەستینی، دوای خۆکێشانەوەی دەروێش له ژیانی حزبی و کاڵبوونەوەی هەستی ئینتیمابوونی بۆ ژیانی حزبی و کرانەوەی بەسەر ئەدەبی ئینسانی، دەبێت دان بەوەدا بنێم که ئەو شاعیره گرەوی له هەمووان بردەوە، دوور له شیعری بەرگریش هەر شاعیر مایەوە، بەبێ ئەوەی بچێته ناو ئاپۆرەی بەیاننامەکانی نوێگەری شیعری عەرەبییەوە، سەرقاڵی جوانکردنی ماڵه شیعرییەکەی خۆی بوو، له شاعیرێك که وێردی سەر زاری نەتەوییەکان بوو، بووە شاعیرێکی ئینسانیی گەورە و خوێنەری له هەموو جیهاندا پەیدا کرد. کارێکی سەختە شاعیرێك بتوانێت وەکو مار کاژ فڕێ بدات و له ئاوی شیعری نوێ بدات و ڕای گشتی خوێنەرەکانیشی بەو بەرگه تازەیە بباتەوە. سەختە له گەڕەکێکی ناوەوەی خۆت باربکەیت و به شوێن گەڕەکە نوێکانی ناخدا بگەڕێیت، مەحموود دەروێش بەو بارکردنە دەستی له هەموو ئەو مەدح و سەنایە هەڵگرت که نەتەوەییەکان بۆیان مسۆگەر کردبوو، حەزی جوانی و داهێنان وای لێ کرد خانووێکی شیعریی بەناوبانگ بگۆڕێتەوە به دانیشتن له بیابان، بیابانی زمان و مانا، گەڕان به شوێن گوڵه نەناسراو و بێناوەکانی شیعر. دەرچوون له چاوەڕێکردنەکانی خوێنەر، دژایەتیکردنی

ئەگەرەکانی خوێنەر. گەیشتە ئەو بڕوایەی کە گریانی منداڵێك و نەبوونی قەوارەی سیاسی بۆ گەلێك بەقەد یەك کارەساتن، دەستپانکردنەوەی منداڵێکی بنێشتفرۆشی دووڕیانێکی سەرجادە و هەڵنەکردنی ئالآی میللەتێك بەقەد یەك جەرگبڕن!کاتێك میللەتەکەی بەسەر دوو حزبدا دابەش بوو، نەبووە کەرتە شاعیر و دوژمنداری کەرتێك، بەڵکو شیعری بەرز بۆوە و بووە ئاسمان کە تیایدا جێی سەری هەمووانی لێ دەبۆوە. بۆ شاعیر بردنەوەی گرەوی شیعری لە بردنەوەی گرەوی سیاسی گرنگترە، شیعر هونەری مومکین نییە، هونەری گەڕانە بە دوای مەحاڵدا، هونەرێکە لە دەرەوەی زەمان و مەکان، هونەرێکی سوودبەخش نییە بۆ خودی شاعیر، هونەرێکی چێژبەخشە بۆ خوێنەر. سەرەتا مەحموود دەروێش شیعری کردبووە ئامراز بۆ خوڕاگریی میللەتەکەی، دواتر خۆڕاگریی میللەتەکەی کردە ئامراز بۆ بەرهەمهێنانی شیعرییەت، لە نێوان ئەم دوو ئاراستەیەشدا ئیشکالییەتێکی گەورە هەیە. من ناپرسم لە هەوێنی شیعر، بەڵام مکوڕم لەسەر ئەوەی شیعر تەنیا هەوێنە بۆ جوانی، پەندێکی گەورەیە لە مەحموود دەروێشدا کاتێك شکۆ بۆ شیعر دەگەڕێنێتەوە و ئامانجی شیعر لە گوتارێکی ئایدۆلۆژییەوە دەگۆڕێت بۆ گوتارێکی ئیستاتیکی، لە هۆز و نەتەوەوە دەبیاتە ئاقارە ئینسانییەکان، دۆزینەوەی ناهەقی بەرامبەر بە پشیلەیەك لە ڕووی شیعرییەوە جیاواز نییە لە دۆزینەوەی ناهەقی بەرامبەر بە ئینسانێك، تێرکردنی منداڵێکی برسی لە ڕووی شیعرییەوە جیاواز نییە لە هەڵکردنی ئالآی میللەتێك. مەحموود دەروێش لە ژیان و

نووسیندا هەر شاعیر بوو، شاعیر هەیە بە شیعر پەپوولەیە و لە ژیاندا گورگ، ئەو لە هەموو شتێکدا شاعیر بوو، خەفەتی لە عەینەکەکەی دەخوارد کە مەعدەنێکە و تواوێتراوەتەوە و چەمێنراوەتەوە و شێوێندراوە و کراوەتە عەینەك، خەمی لە قەنەفەکەی دەخوارد کە دەسکەکانی لە گۆشتی دار سنەوبەر دروست کراوە، بە پەرداخ ئاوی نەدەخواردەوە، چونکە پێی وابوو پەرداخ زیندانی ئاوە. تا مردیش، بەو حەسرەتەوە مرد بۆ شیعر (بە قودرەتی قادری شاعیر) نابێتە نان و برسییەکان شاگەشکە بکات؟! مردنی مەحموود دەروێش، مردنی کۆترەکەی حەزرەتی نووحە بە چڵە زەیتوونێکەوە، بەڵام پێش ئەوەی ئەو شاعیرە کۆترە بمرێت وشکایی و کەناری بە شاعیران نیشان دا، کەناری شاعیریش تەنیا جوانییە، بێجگە لە جوانیش ئەوەی لە شیعردا دەمێنێتەوە، تۆفان دەیسڕێتەوە.



## ڕۆستەم ئاغالە

**لە نێوان بینینی منداڵ و ڕەتکردنەوەی گەورەبووندا**

هونەرمەندی شێوەکار و فۆتۆگرافەر ڕۆستەم ئاغاڵە، یەکێکە لەو هونەرمەندە شێوەکارانەی کە ساڵانێکی زۆرە مشتومڕێکی زۆر دەربارەی بەرهەمە هونەرییەکانی لە ئارادایە، کەم هونەرمەند هەیە هێندەی ئەو ڕووبەڕووی نەیاران و تێبینی و ڕەخنەی نەشیاو بووبێتەوە، کە جار بووە پەیوەندیشی بە هونەرەوە نەبووە! کەم هونەرمەندیش هەیە هێندەی ئەو هونەرەکەی سەرنجی بینیەکان ڕاکێشێت و ببێتە جێی سەرنج و ستایشی بینەرە بینیەکان، ڕۆستەم لە نێوان گلەیی هاوەڵەکانی و ستایشی بینەرەکانیدا هەمیشە تاکەوەڵامی لە ڕێی تابلۆوە بووە، ئەوەی ئاگاداری شریتی عومری ئاغاڵە بێت، پێی سەیر دەبێت چۆن بیست ساڵ لەمەوبەر وازی لە هونەر نەهێناوە؟ ڕۆستەمی بەردەم لێشاوی ڕەخنە بە باوەڕبوونی بە بەهرە و توانای خۆی ئێستا بووەتە ڕەنگێکی گەرم لە ناوەندە پەیوەندی ساردەکەی هونەری کوردی.

ناوەندی ئەدەبی و هونەری کوردی، وەکو ناوەندێکی بێ مێژوو (مێژووی ئیبداعی) هەمیشە ناوەندێکی وابەستە و لاساییکەرەوە بووە، بەشێکی بەرچاو لە هونەری کوردی پاشکۆی مۆدێل و ستایلی خوازراو بووە، هەندێ لە شێوەکاران ستایلی هونەرییان لە مەلزەمەکانەوە دەهێنا و بە بینەرە بەستەزمانەکانی کوردیان دەفرۆشتەوە، بێ ئەوەی بزانن، یان بیانەوێ تێبگەن، کە بەجیهانیبوون لێرەوە دەست پێ دەکات، ڕۆمانەکانی مارکیز بچووکترین وردەکارییەکانی ژیانی

کۆلۆمبیەکانی لەخۆ گرتووە، ئەگەر بێت و وانەبوایە کەس ئاوڕی لێ نەدادەیەوە، بە جیهانیبوونی هەر هونەرێك لە لۆکاڵییەوە دەست پێ دەکات و لێرەوە دەپەڕێتەوە دنیا، ئەوانەی ڕەخنەیان لە هونەری ڕۆستەم دەگرت ئەوانە بوون کە پێیان وابوو لە خواستنی ستایلی خۆرئاواوە دەبنە پێشەنگ، گلەیی و ناتۆرەیان لە لۆکاڵیبوونی بەرهەمەکانی ڕۆستەم دەگرت، دواتر دەرچوو هەرچی خۆرئاواییە زیاتر بەرەو هونەری ئاغاله دەکشێت و گرنگی پێ دەدات، چونکە بەرجەستەکردنی ڕۆحی خۆماڵییە و هەڵگری تامە هونەرییەکانی ڕۆژهەڵاتە، فرۆشتنەوەی بەرهەمی خوازراوی خۆرئاوا بە خۆرئاواییەکان بەهەدەردانی توانا و بەهرەیە، نمایشکردنی کاڵایەکی ناسراو و باوە و کەس گرنگی پێ نادات، بەهرەمەندی ڕاستەقینە هاواری خۆی بە گۆرانیی خەڵکی ناگۆڕێتەوە، دەریشچوو ڕۆستەم لە مەودای دوور چەند براوەی گرەوی داهێنانە و چەند خۆڕاگریش بوو لەبەردەم ئەو هەموو هێرشە ناڕەوایانەی دەکرایە سەری، شێوەکار گرنگ نییە بتوانێت باش لە بارەی شێوەکارییەوە قسە بکات، گرنگ ئەوەیە باش بتوانێت تابلۆ بنەخشێنێت.

گۆرانیبێژ گرنگە بتوانێت باش لەبارەی هونەرەوە قسە بکات، بەڵام لەوە گرنگتر ئەوەیە بتوانێت باش گۆرانی بچڕێت و نەشاز نەکات، هێرشی تەجریدخوازەکان بۆ سەر ڕۆستەم دەرچوو کە هێرشێکی نابەجێیە و ئەوە خۆرئاوا خۆی خەریکە باوەڕی بە ڕەنگ نامێنێت و دەگەڕێتەوە بۆ نمایشکردنی ئایدیا و ئەندێشە، لە ڕێگەی هونەری پۆست مۆدێرنێتە دەگەڕێتەوە بۆ باوەشی

ژیان خۆی، دەگەڕێتەوە بۆ باوەشی خودی ئینسان، دەگەڕێتەوە بۆ گەڕاندنەوەی جوانییەکانی دنیا و ئەو پەرشوبڵاوییە و ئەو فرەییەی کە لە جیهاندا هەیە. ئەوانەی ئێمە لێرەوە دەڕۆن و خۆرئاواش لەوسەر گەڕایەوە، ئەوانەی ئێمە ژیانیان بە جۆگەلە شوبهاند و لە وەهمی پەڕینەوەدان، کەچی خۆرئاوا گەڕایەوە بۆ ئەو قووڵییەی جیهان و ئینسان کە چەشنی دەریایە. خانمە هونەرمەندی ناوداری عەرەب "فەیروز"، هەمیشە بەوە ناسراوە کە گۆرانییەکانی داکۆکی لە منداڵبوونەوە و گەورەنەبوون دەکات، گۆرانییەکانی هی ئەو منداڵانەیە کە نایانەوێت لەسەر جۆلانە بێنە خوارەوە، نایانەوێت گۆی زەوی بە تۆپە لاستیکەکانیان بگۆڕنەوە، دەیانەوێت لە ڕێی بینینە جوانەکانەوە، ناشیرینییەکانی دنیا و ڕۆژگار فەرامۆش بکەن، تابلۆکانی ئاغاله لە وێناکردنی سروشت بە چاو و بینینی منداڵانەوە بەهایەکی پاك و سۆزدار دەبەخشنە شتەکان، لە هونەری ئەودا دەشێت گوێدرێژێك چەشنی بووکێك برازێتەوە و کورتانە ڕەنگدارەکەی لە کەوای ژنێکی نازەنین بچێت، هێنانەوە و گەڕاندنەوەی جوانی بۆ کورتانی گوێدرێژێك، یان پردێکی رووخاو، یان درەختێکی سووتاو، مەغزای گەڕاندنەوەی دنیابینییەکە کە پڕە لە سۆز و بەزەیی، پڕە لە بەرائەت و لەخۆبووردەیی، کە ئەمانە هەمووی لە دنیای منداڵانەوە هەڵدەقووڵێت، لای منداڵێك دەشێت سێبەری درەختێکی سووتاو بکرێتە نیشتمان، دەکرێت بانگدانی کەڵەشێرێك یان باعاندنی بەرخێك بکرێتە سروود و هوتاف، زمانی ڕەنگ لە تابلۆکانی ڕۆستەمدا، زمانی یادەوەرییە، ڕەنگ

دەبێتە ڕووداوێک کە لە قوژبنێکی ڕابردووماندا هەڵکوڕماوە، گرنگی تابلۆکانی ڕۆستەم بە پلەی یەکەم لەوەدایە کە ئەو پێش ئەوەی بۆ بینەر ڕەسم بکات، بۆ خودی خۆی دەیکات، ئەو بە شوێن گەڕاندنەوەی تامەکانی یادەوەریی خۆیدا دەگەڕێت، بۆیەشە ناکەوێتە ژێر کاریگەری هیچ هونەرمەندێک، چونکە لە ژێر کاریگەرییەکی قووڵتردایە کە منداڵیی خۆیەتی، ئەو لە کالیفۆرنیاش بژی ئەو دەرگا کۆن و پیسانەی کۆیە بەرۆکی بەرنادەن، ئەو کۆڵانە تەسک و تروسکانەی کۆیە خەیاڵی فراوان و بیرۆکە و ئەندێشەی گەورەی پێ دەبەخشن، دڵنیاشم کاتێک لەبەر سپلیتەکەی گەلەرییەکەی ماڵی خۆیشی لە سلێمانی دانیشتووە، بۆنی گیای سەر مەنجەڵە ماستەکانی کۆیە دەکا، ڕۆستەم لەو یادەوریانە دەربچێت، ڕووبەرووی گەورەبوون دەبێتەوە، ئەو کاتەش دەبێتە کەسێکی ئاسایی و بەدەم کڕینی پەتاتە و سەوداکردنی پارچە قوماشێکەوە، شین و مۆر دەبێتەوە. گەورەبوون و دوورکەوتنەوە لە منداڵی بۆ هەر هونەرمەندێک، واتای دوورکەوتنەوە لە کانییەکانی بەهرە دەگەیەنێت.



شەیداهۆ و حوسێن مەردان

تا منداڵێکی برسی مابوو

ڕێزی جیهانیان نەگرت

لە مێژوودا، ئێستاشی لەگەڵدابێت: مەی و ژن، دوو قیبلەنمای شاعیرانن، هێندەی ناوی باخۆسی خواوەندی مەی لە شیعردا هاتووە، هێندە ئاوڕ لە مەزنییەکانی ئەرستۆ نەدراوەتەوە. هێندەی بە جوانییەکانی ئەفرۆدیت هەڵدراوە، ناوی قەیسەرەکان نەبراوە! مەی، خەونی گەیشتن بە ئاگایی بووە لە ترۆپکی خۆلەبیرکردندا! ئومێدی دەستەبەرکردنی پاکی بووە لەوپەڕی گوناهدا! بۆ شاعیران، مەی و ژن هەریەکە و باڵێکی فڕینە.

حسێن مەردان شاعیری یاخی و یاخییەکان، شاعیرێك کە ڕۆژانە خەمەکانی ئینسانی بە دیتۆڵی عارەق دەشۆری، شەوانە بە خەیاڵی کحولاوییەوە ڕەشماڵی وشەی بۆ لانەوازان چێ دەکرد. مەردان بابایەکی عاشقی بێ ژن و منداڵ، بێ ماڵ و مەئوا، تەنیا بۆ شیعر و بە شیعر دەژیا، ئەوی هەمیشە مەست، لە ئاست خەمی هەژاران، لە وەزیر و گزیر بە ئاگاتر بوو، چەشنی مەسیح بە ئازاردانی خۆی، دنیای لە گوناه پاك دەکردەوە، کەم شاعیر لە مێژووی عێراقدا هەن ئەوەندی مەردان شیعری لە ژیانی بچێت، ئەو لە شیعر و ژیاندا بەقەد یەك یاخی بوو! ئەو لەو کەسانە نەبوو لەبەر ئاگرداندا ژنێکی میهرەبان شۆربای گەرمی نیسکێنەی بۆ بێنێت و سەعاتێك لەگەڵ منداڵدا یاری حەچەکەرە بکات و دواتر شیعرێك لەسەر یاخیبوون بنووسێت! بەڵکو ئێسقانی جۆگەلەی کحول بوو، چاوی فەناری خەمان! ڕێزی ئەو جیهانەی نەدەگرت کە تیایدا کەس تێبینی خەمی پیرەمێردێك ناکات کە لە پەنا دیواری مزگەوتێکەوە بە دیار فرۆشتنی

تەسـبیحەوە وەنەوز دەدا! کەس تێبینـی نەهـامەتیی منـداڵێکی کلێنسـفرۆش ناکـات لە چوارڕیـانی شـەقامێکەوە دنیـا یەکسـان دەکات بە نەبوونی!

سـەیرە، شـیعر: مەوداکـان، زەمەنەکـان، شـوێنەکان تەفروتونـا دەکا، دەشـێت دوو شـاعیر لە هەمـان کاتـدا لەیەك ڕووبـار مەلە بکەن! لێرەوە کۆکردنەوەی حسێن مەردان و ئیـدریس شـەیداهۆ ئاسوودەم دەکا! ژیانی ئەم دووانە چەنـد لەیەك دەچێـت! وێـڕای جیاوازییان لە تەمەن و سـەردەمدا، وێـڕای دوورییـان لە کـات و شـوێندا، خەمەکـان، ئومێـدەکان، ماناکـان بەرەڤـانی لە یەکـدی دەکەن!

من و ئیدریس کوڕی یەك گەڕەك بـووین، لەگەڵ هاوڕێیـانم سەرکەوت ڕەسووڵ و ئاوڕەحمان مـارف و جەوهەر شـێخانی و سەعدوڵلا نووری و دەروێش جەوهەر و محێدین تەهـا.. هەمـوو ترێکانمان دەچووە ناو یەك گۆزەوە، ئەویش گۆزەی خوێندنەوە و نووسین بوو، ئەو ترێیانەی ئێمە چەنـدەی بـۆتە شـەراب، بـۆتە داهێنـان ئەوە مەسـەلەیەکە بـۆ مێـژوو دەمێنێـتەوە، بەڵام ئەوسـا و ئێستاش هەمووومان لەسەر ئەوە کۆك بووین کە بەرهەمی ئەدەبیی ئیـدریس شـەیداهۆ بە بەهـرەی دیـکەوە موتـووربە کرابـوو، بە بەهرەی هەستێکی ڕۆژنامەنووسانە کە ئەوسا بە تەواوی نرخیمـان نەدەزانی، ئەوسا ئەدەبی کوردی و ئەدیبی کـورد بە شـێوەیەکی گەردوونـی لە بەهـای نووسـینی دەکـۆڵییەوە، دنیـا و حەشـری تێکەڵ بە ئەدەب دەکرد، هەرچی خوای زەردەشتی و ڕۆمـانی هەیە دەیئـاخنییە نووسـینەوە. دەبـووە فریادرەسـی کێشـە

کەونییەکـان، هـیچ ئـاوڕێکی لە شـت و خەمە بچووکەکـانی دەوروپشتی خۆی نەدەدایەوە، سـادە نەبوو، ئەدیـب عەیـبە بـوو بگـری، دەستەوەسـتان بـێ، بـێ وەڵام بـێ، بە دەسـتی گومـانەوە گیرۆدە بێ، ئەدیب دەبووایە سوپەرمان بـێ، شـەیداهۆ وا نەبـوو، ئاوڕی لە خەمە نادیار و پەراوێزکراوەکان دەدایەوە، لەناو خەڵك بوو، بـۆ خەڵکـی دەنووسـی، سـادە و بێگـرێ بیـری دەکـردەوە، هەرچەنـدە شـەیداهۆ چەن سـاڵێك لە ئێمە بە تەمەنتـر بـوو بەس ڕۆحی منداڵی هەبوو، لە ئێمە کەمتر دەیخوێنـدەوە بەڵام چـونکە هەردەم بە هەستی ڕۆژنامەنووسانەی خۆی دەژیا، ئەوا سـادەتر و بێگرێتــر دەینووســی. شــارەزایی ئەتــۆی لەبــارەی ئەدەبیــاتی جیهانییەوە کەم بـوو، بەڵام ئەدەبیـاتی کلاسـیکی کـوردی بـاش دەناسی، ئەویش لە شێوەی مەردان بەو شـێوەیە ژیـا کە ویسـتی، بێ ماسك و بێ مکیاژ ژیا، ئیدریسـیش وەرزێکـی دیکەبـوو لەو تێکنەگەیشتنە ئەزەلییەی لە نێوان شـاعیر و ئەوانـی دیـکەدا هەیە. لە گۆشەنیگای داهێنـانەوە شـەیداهۆ هەقـی خـۆیەتی لۆچەکـانی نێـوچەوانی خـۆی بە بەرزی و نزمـی چیـای حەمـرین دەچوانـد. شیعرەکانی ئیدریس تـێکەڵەیەك بـوو لە نێـوان خەم و تـووڕەیی، خەم بۆ وڵات و تـووڕەیی لە خەڵـك، خەمەکەی جێـی سـتایش بـوون، بەڵام تـووڕەییەکەی لە هەنـدێ شـوێندا دەقەکـانی لار دەکـردەوە بـۆ دارشـتنی ڕاسـتەوخۆ، ڕاسـتەخۆییش تـا ڕادەیەك زیـانی بە شـیعر گەیانـدووە، شـیعری ڕاسـتەوخۆ وەك وێـنەی فۆتۆگرافی وایە، بێ جووڵەیە، ئەگەرەکانی خوێنەر لەناو دەبات، بەهرەی خوڵقاندنی مانا کەم دەکـاتەوە. لە کۆتاییەکـانی ژیانیـدا،

شـەیداهۆ گەیشـتبووە ئەو ئاسـتەی لە نووسـیندا شـتە شەخسـی و شتە زاتییەکان جوداکاتەوە، چونکە ئەدەبی شەخسـی بەس هـی خۆیەتی و ئەدەبی زاتییش، زاتی هەموومانە.

شـەیداهۆ لە شـێوەی مەردان دەیزانـی شـیعر دەزووێکـی بە نرخە بۆ بەستنەوەی مرۆڤ بە جوانییەوە، بۆ سەندنەوەی زوڵـم لە واقیع.




## مەدحەت کاکەیی

**خەونێکی سەوز لەناو سەرێکی سپیدا**

یەکێك لە سوودەکانی ئەو نەشتەرگەرییەی بۆ چاوم ئەنجامم دا، ناسینەوەی کەسەکانە لە دوورەوە، چەند ڕۆژێك بەر لە ئێستا بە بەرزاییەکەی گردی سەرچناردا بە ئۆتۆمبێل سەردەکەوتم و لە دوورەوە کورتە باڵایەکی کراس و شەرواڵ ڕەشی، سەر سپی، خێرا خێرا بەرەو ڕوومدا غلۆر دەبۆوە، زانیم هونەرمەندی شێوەکار مەدحەت کاکەییە. من لە کۆتایی نەوەدەکانەوە کاکەیی دەناسم، ئەوسا کادیری مەکتەبی ڕێکخراوەکانی یەکێتی بووم و لە ڕێی کاك مەلا بەختیارەوە مەدحەتمان ناسی، چاوپێکەوتنێکی تێروتەسەلیشمان بە سێ قۆڵی (کاك مەلا بەختیار و هونەرمەند قادر میرخان و من) لەگەڵیدا ئەنجام دا و لە گۆڤاری گەلاوێژی نوێ بڵاوکرایەوە، زۆربەی گفتوگۆکانیش لەبارەی ڕەشەوە بوو، هەر بۆیە ناونیشانەکەمان کردە (پەمەیترین گفتوگۆ لەسەر ڕەش).

ئەوکات مەدحەت پێشانگایەکی هاوبەشی لەگەڵ شیعرەکانی ئەدۆنیسدا ئەنجام دابوو، ئەمە بووە مایەی سەرنجی من، چونکە زۆر دەقەکانی ئەدۆنیسم خۆش دەویست، لە یەکێك لە گۆڤارەکانی فەرەنساشدا وتارێکی ئەدۆنیس لەبارەی کارەکانی مەدحەتەوە بڵاوکرابۆوە، چەندمان کرد بە عەرەبی وتارەکەمان دەست نەکەوت، دواتر بە زمانی ئینگلیزی دۆزیمانەوە،

مادەمەکێ کەوتمە نووسینەوەی ئەم وردە یادەوەریانە، پێویستە ئەوەش بڵێم کە ڕۆژنامەنووسی خوالێخۆشبوو ئازاد سادق (کە ئەوسا لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ کاری دەکرد)، ستوونەکەی ئەدۆنیسی وەرگێڕایە سەر زمانی کوردی و لەگەڵ چاوپێکەوتنەکەدا بڵاومان کردەوە.

لەگەڵ مەدحەت وێڕای خۆشەویستیی هونەر، ئەدۆنیس کۆی دەکردینەوە، یەکدوو کتێبی ئەدۆنیسیشی پێ دام کە ئەوکات لە کوردستان دەست نەدەکەوت. لەوساوە من بە ڕوونی دەزانم کە مەدحەت لە هەموو شتێکی زۆرە: ڕاستگۆیی، پاکی، دڵسۆزی.. تەنیا لە شتێکی کەمە: ئەویش نازانێت یارییەکانی ڕاگەیاندن ئەنجام بدا. مەدحەت نەیتوانیوە لە میدیای کوردیدا شوێنی شایستەی خۆی پێ بدرێت. لە بینینی ئەمجارەیاندا ئۆتۆمبێلەکەم ڕاگرت و ئەویش لە غلۆربوونەوە وەستا و بەیەکەوە چووینە شوێنی کارەکەم و لە ئەحواڵیم پرسی، چەشنی هەموو ئەوانەی ئەم نیشتمانەیان خۆش دەوێ (بەبێ ئەوەی یەك بەڵگەش بدۆزنەوە وەك پاساوی ئەم خۆشویستنە) زۆر نائومێد بوو. جا ناهەقیەتی؟ لە گوندێکی دڵڕفێنی نزیك پاریسەوە هاتۆتەوە و دەیەوێت لە کەرکووك مۆزەخانەیەکی هونەری بکاتەوە. مۆزەخانەش لەم وڵاتەی ئێمەدا و لەم زروفەی گیرۆدەی بووین،

لای زۆرێـك لە دەسـەڵاتداران یەکسـان نیـیە بە تانکەرێـك کە دەتوانێــت ٣٦ هەزار لیتــر نەوت بە قاچــاغ بگــوازێتەوە. لای زۆرێك لە دەسەڵاتداران سەرجەم تابلۆکانی شێوەکاران و هەموو ڕەنگە سارد و هێمنەکان یەکسـان نیـیە بە شیرەشیرٍ و تەقەتەقی موەلیـدەیەکی جـۆری ڤـالکۆنی چینــی کە لە مەزرەعەکانیانـدا دەنەڕێنن. سـەیریش لەوەدابـوو دیزاینـی مۆزەخـانەکە لە شـێوەی کەشتیی نووح کرابوو، وەك ئەوەی مەدحەت لە نـاخەوە هەسـت بکـات خەڵکـی کەرکـووك پێویسـتیان بە دەربـازبوون هەبێـت، دەربازبوون لە قەرەباڵغیی ئەو دروشمانەی لە کۆتاییدا یەکسانە بە تەنیایی! دەربازبوون لەو بۆن نەوتەی لە کەرکووکدا گەواهییە بۆ نەبــوونی! یەك بە خـۆم کـامەرانم بەوەی وێـڕای ئەو هەمــوو ئاوڕنەدانەوەیە، هێشتا دڵی مەدحەت وەکو سەر و سـمێڵی سپییە، دەنا دوایین پێشەنگای ئەو لە پاریس گرنگییەکی زۆری هەبـووە لە لایەن هونەرمەنــدانی ئەوێ و دەزگاکــانی ڕاگەیانــدن لە پاریس، تیایدا تابلۆیشی فرۆشرابوو، کەچـی گـوتی: بـۆ دەرمـان کــوردێکم نەبینــی بێــتە پێشــەنگاکەم! بە زۆربەی زمانەکــان پیرۆزبــاییم لــێ کــرا تەنیــا بە کــوردی نەبــێ! لە هەمــوو گفتوگۆکانیشــدا ســەرەتای چاکوچۆنییەکـانم ئەوەبـوو کە مـن هونەرمەندێکی کوردم.

کاتێ لێشم پرسی چۆن بتوانم وردەکارییەکانی ئومێد و گرفتە هونەرییەکانت بزانم؟

ئەو دێڕەی حاجی قادری کۆیی بیر هێنامەوە:

**شەرحی غەریبی من و غەم نایەتە تەحریر**

**پێت دەڵێم چۆنە ئەگەر چاوم بە چاوت کەوتەوە؟**

## لەبارەی کتێبی شیعریی
## (لە کەوتنەخوارەوەشدا باڵەکانم ئاسمانیان هەژاند)ی
## تەرزە فایەقەوە

چەنـد مـایەی بەختەوەریـیە کاتێـك ژنێـك دەبینـی جـوان دەنووسێت، جوان بیر دەکاتەوە، بە ڕاستی بیر دەکاتەوە، نووسین و بیرکـردنەوەی ئەو ژنە نـا، کە پۆشـتەوپەرداخ دەیبینـین و بە مکیـاژەوە لە قاوەخـانەیەك جـگەرە دەکێشـێ، بەڵکـو نووسـین و بیرکردنەوەی ئەو ژنەی لە مەتبەخەکەیدا بە ورتە ورت گـۆرانی دەڵـێ و قـاپ و قاچاغەکـان بـۆی دەبـنە کـۆرس. ئەو ژنەی جـورئەتی هەیە تەنیـایی خۆیمـان بە هەمـوو هەڵەکـانییەوە بـۆ بگێڕێتەوە، ژنێك کە ڕاشکاوانە بڵێ حەز دەکەم یەك سـەبەتە دڵ و جەرگی ئەو پیاوانە کـۆکەمەوە کە جـوانیی منیـان دەوێ، ئەو ژنەی بوێرێت ئەو ساتانەمان بۆ بنووسێت و بـڵاو بکـاتەوە کـاتێ چەقۆی کوڵەری لە دەستێکە و باینجانێکی لە دەستەکەی تـردایە و چاوی بڕیوەتە خاڵێکی سـفرەکە و ئاگـای لە خـۆی نەمـاوە و بیر لە شەخسیترین گرفتـی ئینسـانیانەی خـۆی دەکـاتەوە. بەهـای جوانی ئەو کتێبەی خاتوو تەرزە لەوەدایە شـەرم لە شکسـتەکانی ژن ناکا، بەڵکو شکستەکانی ژن بە شکستی ئینسان دەزانێ. ژنـی پشت مایکرۆفۆن نییە: ژنی ڕاستەقینەی نـاو زمـان و ئەبـجەدیەتە. من زۆر دڵخۆشم بەو کـۆمەڵە ژنە نووسـەرەی لە ئێسـتادا لەگەڵ مێژووی خۆیان ئاشت دەبنەوە، بە درێژایی سەد ساڵی ڕابـردووی

ئەدەبیاتی ئێمە، شاعیران، نووسەران، ڕووناکبیران هەموویان ئـازا و چاونەترس بوون، پاڵەوان بوون، واعیز و عاقڵ بـوون، حەکـیم و خاوەن قسەی نەستەق بوون، کەسیان بۆ سـاتێکیش لە شـێوەی ناوە گەورەکـانی ئەدیبـانی دنیـا بیریـان نەکـردۆتەوە، لە شـێوەی پـاڵەوانە بـێ نـاوەکەی ڕۆمـانی (دۆزەخ)ی هەنـری بـاربۆس و بپرسـێت (ئەرێ ئەو خەڵـکە مەبەسـتیان چیـیە لە هەقـیقەت؟). کەسیان وەکو ج. هـ. ولز نەیـانگوت (زەمەن وەکـو تـاڤگەیەکی بەخوڕ وایە، ئینسانەکان بە کامەرانییەوە دەبا، ئینسانەکانیش لەنـاو دەچن وەك چۆن خەون لە بەرەبەیاندا لەناو دەچێت). نـا.. وەکـو ئـالیۆت نەیانپرسـیوە (کـوا ئەو ژیـانەی بە گـوزەران لە دەسـتمان چوو؟). لە ئەدەبیـاتی ئـێمەدا دەبـوایە ئینسـان نێـر بێـت: نەگـری، چونکە نابێ نێرینە بگری. نەدۆڕێ: چونکە نابێ دوژمن دڵی پـێ خۆش بێ. قسـەی نەسـتەق بکـا: چـونکە نـابێ کـۆمەڵ و نەتەوە وشیار نەکرێتەوە، من چەنـدی خوێنـدومەتەوە ئەدەبـێکم نەدیـوە هێندەی ئەدەبیاتی کوردی خـوێنەر و خەڵـك بە نەخوێنـدەوار و نەزان و ناهۆشیار لە قەڵەم بدا، بۆیە دەبینین ئەدەبی ئـێمە ئەدەبـی نێرینەیە بە ئیمتیاز، تەنانەت هێندەی دەستەواژەی دوژمـن بە کـار هاتووە، نیو هێندە ناوی بازن (نەك پەپوولە) نەهاتووە، ئەم قسـەیە بۆ ئەدەبیاتی ژنانیش تا هاتنی ئەم نەوەیە هەر ڕاستە، پێشتر دەبـوا نووسینی ژنان وەکو ئەو قسانە بێـت کە لە مەجلیسـەکانی پیـاوان دەیانکرد، نووسینی ژنان لە هەمان ئەو فەرهەنگی شەرمەوە بێـت کە جوانیی ژنانی لەسەر وەستا بوو، بەڵام لە ئێستادا چیتر ژن ئەو کائینە شەرمنە نییە ئەو شتەی دەینووسێ پێچەوانەی ئەو شتە بێت

بیری لێ دەکاتەوە، چتر ئەو دراوە دوو ڕووە نییە تا نرخ پەیدا بکا، ژنان (لەم کتێبەی تەرزە فایەق-دا) بەسەر ئەو کارەساتەدا دەکرێنەوە کە مێینە تاکە گرفتەکەی پیاو نییە، بەڵکو ئەو ملیارەها ڤایرۆسەیشە کە لە هەوادا هەن و دەشێت لە لەحزەیەکدا پەی پێ ببەن، لە لەحزەیەکدا تووشی شێرپەنجەی مەمکی بکەن. لای من فەرهەنگ و زمانی بێجەدوایی و عەبەسی ژنان بە قازانجێکی گەورە بۆ ئەدەبیاتیان دەگەڕێتەوە، چونکە ئەدەبیاتی مانا و جەدوا کەمتر دەمێننەوە و شیعریەت بەرهەم دێنن، کوا ئەو هەزاران فەردە شیعر و چیرۆك و ڕۆمانەی بلۆکی ڕۆژهەڵاتی و شیوعییەکان بە ناوی یەکسانییەوە دەیاننووسی؟! کوا ئەو هەزاران فەردە شیعر و چیرۆك و ڕۆمانەی یەهودییەت و مەسیحییەت و ئیسلامییەکان بە ناوی ئەخلاقەوە دەیاننووسی؟! چییان بەسەر هات و بۆ نەمانەوە؟! چونکە ئەدەبی گشتگیر و سەرکەوتن بوو، لە کاتێکدا ئەوە شسکپیر، ئەوە هەمنگوای، ئەوە مارکیز، دیستۆفسکی، بۆدلێر، هۆگۆ، کازانزاکیس، گۆتە، ئالیۆت، فۆکنەر، نەجیب مەحفووز، دانتی، سەدانی تر، هەر مانەوە، ئێستاش کتێبەکانیان دەخوێندرێنەوە، ئێستاش کۆڵەکەی دارشتنن. مانەوە چونکە لەگەڵ خۆیان و ڕاستی وجوودی ئینسانییانەی خۆیان ئاشت بوونەوە، لە ئەدەبیاتی ئێمەدا چەندیان نەبوونەتە واعیز و مەلای شیعری؟! بێجگە لە نالی کێی دیکە ئامانجی جوانی و دارشتن بوو؟! کێی دیکە هەستی بە کورتی تەمەن و بێ مانایی زمان کرد؟! حاجی قادر نەبووە مێژوونووس لە ڕێی شیعرەوە؟! ئەحمەدی خانی هەر وا نەبوو؟! مەحوی

نەبووە ستایشکاری عەبدولحەمیدی دووەم؟! قانع نەبووە موسلیحی ئیجتیماعی؟! کوا ئینسان و شکستەکانی؟! کوا ئینسان و عەبەسی وجوودی؟!

لە شیعری ئێستای کوردیدا شتێك هەیە زۆربەی هەرە زۆری ڕەخنەگرانی پەست کردووە، بەس من زۆر دڵم پێی خۆشە، ئەمەشیان لەم کتێبەی خاتوو تەرزەدا بە ڕوونی دیارە، کە تەنیا دەتوانم لە ڕێی دیدێکی سارتەر بۆ بۆدلێر ڕوونی بکەمەوە: سارتەر دەڵێ: "بۆدلێر هەست دەکا وەکو کۆترێکی سپییە لەناو قەلەڕەشەکاندا، بەڵام ئەو سەیر و نامۆیە نەك ئەوان، چونکە ئەوان زۆرینەن، ئەو تەنیا دەتوانێ بە شیعر سەیری باڵە سپییەکانی خۆی بکات و دڵنەوایی خۆی بداتەوە، بەڵام چی بکا ئەو کۆترێکی کوێرە، لە ناخەوە دەزانێ قەلەڕەش نییە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی بۆ سپێتی باڵەکانی شك نابا"، ئەم دیدە لە بەرهەمی ئەدەبیی ئەدیبە لاوەکاندا ڕەخنەگرانی پەست کردووە، چونکە دەستیان لە زیرەکیی خۆیان و گرنگیی ئەزموونی تایبەتییان هەڵگرت، لەبەرەی کۆمەڵگا و نەتەوەوە هاتنەوە بەرەی ئینسان، بە تەنیا ئینسان.

(١)

برینەکان دەبنە وشە، وشەکان لە جەستەی مێژوومانـدا نـابنە برین، مێژوومـان ڕووبـارێکە دووبـارە لێـی دەپەڕینەوە، زمـان و زەمــان و نیشــتیمان هەر یەکە و پەلێکــت ڕادەکێشــن، خەم لە هەناوتدا چرۆ دەکا، ئەرێ تـۆ نەتەوەی یـان دارسـتان؟ شـەومان چەند سەدەی خایاند، ئەرێ خۆری سەر بەیداخەکەت بە ڕاستی خۆرە؟ ئیتر بە کەنار قەناعەت ناکەم، چیتر دوو قەفی پـانتۆڵەکەم هەڵنــاکەم و لە دوورەوە لە نەهەنگەکــان بــڕوانم. کەواتە ئەی نەفسی ئازیزم: بەرەو دەریا، بەرەو قووڵایی دەریا.

(٢)

ئەی نیشتیمان بۆ دەبێ هەموو شتێ بدۆڕێنم
تا بتبەمەوە؟!
ئەوە چۆن منت بردەوە
بێ ئەوەی هیچ بدۆڕێنی؟!

(٣)

شوێنت هەیە بوەستم؟
ئەم زەوییە هەر دەسووڕێتەوە و
لێناگەڕێ ڕۆژگارم لە لات جێ بێڵم.
ژیان هێندە خێرا دەڕوا
بەشی ژاکاندنی قژی ئەو منداڵانەش ناکا
بە خلیسکانەی بەرائەتدا بەرەوپیری غلۆر دەبنەوە.

زۆر لە دار دەچێت:
چەند کۆنیش بێت، دەتوانێت ئاگری گەورە بکەیتەوە.

(٤)

بە خوێندنەوەی خەون نەبێت، مەحاڵ نانووسرێتەوە
لە سێبەرەوە بڕۆ جەستە
لە تەماشاوە بڕۆ بینین
بە سروشت بڵێ مەمنوونت نیم
لەش: پیربوون و نەخۆشی و مردن
ڕۆح: ئەو کاتە ـبا-یە کە کەنار دوورە.

(٥)

دەشێ مێژوو چرپا بووبێت
کەچی بۆ ئێمە هەمیشە سەرین بووە.

(٦)

نەتەوەکەم
لەو جووتیارە دەچێت
کە خاوەنی ڕەگە، بەڵام بەری دیار نییە.

(٧)

ئەو نەتەوەیە لە مێژوودا
خۆی کەوانەیی ڕێ دەکا
بۆیە هیچ تیرێك ناهاوێژێ.



ڕۆژگاری وشك و

چـــاوی تـــەڕ

(١)

چەند ئازایە ئەدەب
نیشتیمان دەکاتە چەترێك
بەشی سەری هەموومان بکا
چەند ترسنۆکە سیاسەت
نیشتیمان دەکاتە کڵاوێك
بەشی سەری هەموومان بکا.

(٢)

ئەبجەدییەتیش تێمان ناگا
لە ئەلفەوە براکوژی دەکەین
لە یائەوە خۆشەویستی.
هەمیشە لە هەمان ڕووبار مەلە دەکەین
پشتەملی مێژوو دەخوێنینەوە
کەچی گلەیی لە دنیا دەکەین
ڕوخساری خۆیمان نیشان نادا.

(٣)

ڕەشایی پێڵووەڕەشەکانی پیرەمێردێکی شەنگالی
ڕەشایی کونە لووتە گچکەکانی
منداڵێکی هەڵکوڕماوی بەر ئاگرێکی ون لە عەربەت
ڕەشایی کراسێکی ئاودامانی پیرەژنێکی مەخمووری
نابنە مەرەکەب

بۆ نووسینەوەی چاوبڕین لە ئاسمانێکی وشك و
ڕاکشان لەسەر عەرزێکی تەڕ.

(٤)

شەنگاڵ سەلماندی
نەك لە زماندا
نەك لە حوکمڕانیدا
نەك لە مێژوودا
نەك لە ئەدەبدا
نەك لە ژیاندا
تەنانەت لە مەرگیشدا کۆنخواز و کۆنەپەرستین و
فۆڕمەکانی مردنمان تازە ناکەینەوە.

(٥)

هەموو ئەو عەقڵانەی
دەچنەوە بەردەرکی زەعیم
عەقڵ نین، پێن.
هەموو ئەو پێیانەی
ناچنەوە بەردەرکی زەعیم
پێ نین، عەقڵن.

(٦)

له شەڕدا
چەکەکانی هەتاویش پێچەوانە دەبنەوە
ڕووناکی دەمی تفەنگەکان
ڕووناکی لە ماڵەکان دەکوژێننەوە و
تیشك دەبێتە یەکێك
لە مورادیفەکانی تاریکی.

(٧)

چ ئافاتێکە
گوڵەبەڕۆژەکانیش ستایشی شەو دەکەن
لەوەتەی هاتنی خەلافەتی ڕۆژهەڵات.



داری ئازادی

(١)

ئەی داری ئازادی
نەك سێبەر، چەندین نەوەت پیر کرد و
نەبوویتە گۆچانیش
بیسەلمێنە کە تۆ لمیت..
ئەو هەموو خوێنە و هەر تێر نەبوویت؟!

(٢)

دەرگای ڕابردوو دەکەیتەوە؟

- مەولانا خالیدی نەقشبەندی بەرە و بەغدا شاربەدەر کرا و لە گەرمای تاقەتپڕوکێنی شارەزووردا کەس جامە دۆیەکی پێ نەدا!

- کەیفی جوانڕۆیی لە ڕێی خۆشناوەتیدا بەرەو ئەستەنبووڵ شاربەدەر کرا و کەس هێشووە ترێیەکی شەقڵاوەی پێ ڕەوا نەبینی!

- حاجی قادری کۆیی، خۆی گوتەنی:

**(هەروەکو شارانی تر کەس ئاشنای کۆیێ نەبوو**
**شوهرەتی ئەبیاتی من خەڵکی لەسەر کۆ کردەوە)**

کەچی بەرەو باوەشی عوسمانییەکان بە ڕێ خرا بەبێ ئەوەی کەس دوو دەنکە هەنجیری تەق تەقی بۆ بخاتە توێشووەکەیەوە!

- مستەفا بەگی کوردی لەسەر خۆشەویستی، لەقەبی ساحێبقڕانی لێ سەندرایەوە و بەرەو ئێران و توران شاربەدەر

کـرا، تـا ئەو ڕادەیەی نـاوی خـۆی گـۆڕی بە (هیجـری) و بە تەوسەوە گوێی ڕادەدێرا بـۆ سـەدای ئەو قـافڵانەی فیـرقەت کە دەیانگوت: سەر قافڵەچی.. یارە!

- دەرگای مێژوو مەکەرەوە:

بەو قەڵەمە قامیشانەی نەبوونە شمشاڵ..

بوونە حەیزەران و نەوەکانی پێ تەمێ کرا

ئێمە خۆشنووسی نووسینەوەی سڕینەوەین.

(٣)

داوای شیعری بەرگری دەکەن؟

- لەگەڵ ئەوەی ئەدیبانمـان بە درێژایـی مێـژوو، بە ئومێـدی ئـاو، شکسـتی سیاسـیەکانیان وەکـو سـەراب لە لمـێکەوە گواستۆتەوە بۆ لمێکی تر

لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم:

سیاسەت کاری بە دەم نییە بـۆ گۆرانیگـوتن، لە دەمـدا تەنیـا ئیشی بە ددان هەیە، گاز بگرێت.

(٤)

لێرە سیاسەت هەموو ئەندامەکانی جەستەی هەیە

تەنیا گوێ نەبێت:

- بۆت هەیە شانی ماچ بکەیت.

- بۆت هەیە دەست بە قژیدا بێنیت.

- بۆت هەیە پیاسەی لەگەڵدا بکەیت.

- بۆت هەیە بە دەمیدا بکێشیت.
بەس نابیستێت و بۆت نییە پرسیار بکەیت.

(٥)

سەدان ساڵە شاعیرەکان
بۆ بەتاڵکردنەوەی سیحری ژێردەستەیی
وەکو منداڵ
بۆقەکانی سیاسەت ماچ دەکەن
کەچی، کەسیان نەبوون بە شازادە.

(٦)

باشە..
شیعر کانیاوێکی پاکە، سیاسەت جلێکی چلکنە:
تەنیا بەم هاوکێشەیە: با تەنافی وشە ببەستین.




## دڵشـاد عـەبـدوڵڵا

### شیعر بۆ تەنیایی و جوانییش بۆ هەمووان

من یەکێکم لەوانەی لە سەرەتای خوێندنەوەمدا بە وردی چاودێریی شیعرەکانی دڵشاد عەبدوڵلا دەکەم و ڕەنگە هەندێ لەو هەورازانەش بناسم کە بە پێ و بە چنگەڕنێ و پیت بە پیت و وێنە بە وێنە پێیاندا سەرکەوتووە، ڕەنگە جاریش بووە (بە سوعبەت بێت یان بە ڕاستی) هاوڕێکانم بەوە تاوانباریان کردبم کە من لە خوێندنەوەی گرنگیی ئەزموونی دڵشاد لە شیعر و تازەگەریدا زیادەڕۆیی بکەم! بەهەرحاڵ هیچ لە ئاسمان کەم نابێتەوە گەر بە ڕەنگی شین تاوانبار بکرێت، بەرزەفڕییش بۆ باڵندە زیادەڕۆیی نییە.

لە ڕابردوو و ئێستای ئەزموونی شیعری ئەم هاوڕێیەمدا دوو خاڵی گەشاوە هەیە، کە دەکرێت لێرەدا وەك سەرەتایەك ئاماژەیان پێ بدەین:

**یەکەم:** لە سەرەتای دەرکەوتنی کاك دڵشاد و هاوەڵەکانی کە دەکەونە کۆتایی ساڵی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکان، شیعری کوردی لەسەر دەستی مامۆستا عەبدوڵلا پەشێو و شێرکۆ بێکەس و لەتیف هەڵمەت ببووە شیعری مانا و شۆڕشگێڕی و بابەتی دەرەکی: دەرەوەی زات و دنیابینیی فەردی، کە ئەم پرۆسەیە بە شێوەیەکی تیلقائی شیعر دەکاتە ئامرازی گەیاندنی بیروڕا، بە ئامانجی بەرهەمهێنانی ڕەعیەتێکی هاوڕا، خوێنەر لەو سەردەمەدا خوێنەرێکی خالیق و بەرهەمهێنەر نەبوو، خوێنەرێك بوو یان ڕازیبوو لەسەر بیروڕاکان یان دژ بوو، شیعری ئەوسا بە شوێن هەقدا دەگەڕا، بە شوێن ڕاستی و درۆ، خراپە و چاکە،

ئەم دوالیزمـانەش ڕێـژەیین و دەکرێـت ئەوەی لای خوێنەرێـك ترۆپکی ڕاستییە، لای خوێنەرێکی دیکە لووتکەی ناڕاستی بێت! بیریشمان بێت کە ئەم جۆرە شیعرە لە هەمـوو شـتێکەوە نـزیکە تەنیا لە تەکنیك نەبێت!

دڵشـاد و هـاوەڵە هەولێرییەکـانی، شـیعریان کـردە مـورادفی جوانی، جوانییش هەمووی دۆستیەتی و نەیاری نییە، شـیعر بـۆ مەنتیقـی هەقـی ڕێژەیـی و نـاهەقی ڕێژەیـی نەمـا، لێـرەوە شـیعر دوورکەوتەوە لە ئایـدۆلۆژیا بە مانـا ئیقسـائییەکەی، لای دڵشـاد چەقی شیعر زمانە نەك مانا و بابەت، چەقی شیعر دەبێتە لێکـدانی بەردەئەستێکانی وشـە و بەرهەمهێنـانی شـەڕاڕەکانی ئەفرانـدن، لە ڕاستیدا شیعر هێنـدەی پەیوەسـتە بە ئەخلاقیـاتی شـیعرەوە هێنـدە پەیوەسـت نیـیە بە ئەخلاقیـاتی کـۆمەڵایەتییەوە، چـونکە ئەمەی دوایی قابیلی گۆڕان و نوێبوونەوەیە.

شیعر لە دەرەوەوە هێنرایە نـاوەوە، ڕەنـگە بـارودۆخی شـەڕی هەشـت ساڵەی نێـوان عێـراق و ئێـرانیش ڕۆڵـی هەبووبێـت، بـۆ یەکەم جـار شـاعیر لە خـۆیەوە سـەیری ئەوانیتـر دەکـات، لە خۆیەوە پێناسەی تەنیایی دەکات، پێشتر عەیب بوو هـانی خەڵـك نەدات بـۆ فیـداکاری، شـاعیرەکان هەموویـان پـاڵەوان بـوون، کەسیان تەنیا نەبوون!

دووەم: لە ئێسـتادا ئەو خـاڵە گەشـاوەیەی کە شـیعری دڵشـاد لەوانەی دیکە جودا دەکاتەوە، جۆری مامەڵەیەتی لەگەڵ زماندا، ئێسـتا بـۆ نیشـاندانی قـووڵیی، زمـانی تەنـك بـۆتەوە، زۆربەی شاعیرانی دیکە بیرۆکەیەکی سادەیان پێیە و دەیـبەنە نـاو ئـامێری

زمان و دەیشێوێنن و دەیشارنەوە و دنیا و قیامەتی تێ دەخەن بۆ ئەوەی قوولْییان نەبینرێت، بۆ مەبەستی کەسبکردنی خوێنەریش پڕی دەکەن لە خەرابات و نەورەس و خوێن و دوژمن! بە کورتی لێرەوە دەڕۆن و لەوسەر نایەنەوە، بیرۆکە باوەکانی ئێمە دەبەن و بە شاراوەیی پێمان دەفرۆشنەوە. بە پێچەوانەوەش دڵشاد خەمێکی گەورە دەخاتە ناو ڕستەی سادە و زوو هەزمکراو، لە نیشاندانی ناوەوەی خۆی ناترسێت، ئەو متمانەی بە وشەکانی هەیە و بە ئەنقەست گرەوەی نەناسینەوەی دەداتە خوێنەر، لە کۆتاییشدا هەموو خوێنەرەکانی دەبنە دڵشادێکی دیکە و لەناو ئەو هەموو دڵشادانەشدا، دڵشادی هاوڕێم دەتوێتەوە و تام دەبەخشێت.

لێرەوەش ئیرەیی پێ دەبەم.. ئەو توانەوەی بە نسیب دەبێت کە نالی و شکسپیر و موتەنەبی لە پێناویدا ژیان. ئەم پێشەکییە پێویست بوو بۆ ئەوەی نموونەیەك بهێنمەوە: ئەو پیاوە بە ویقار و بە سالاچووانەی مەقاماتی عێراقیی ڕەسەن دەچڕن و بە کەسەرەوە دەنگ هەڵ دەبڕن، جیاوازییان زۆرە لەگەڵ گەنجە گۆرانیبێژەکان، گەنج زۆربەی کات بەناوبانگ و ئیعجابی ژنان و گوزەرانی باش و جلی جوانەوە سەرقاڵە کە ئەمانەش خەوشی تیا نییە و شتی ڕەوان، گەنج بە حوکمی سروشتی تەمەنی کە گەرمەی باوەشکردنە بە سەرگەرمییەکانی ژیان، کەمتر گرنگیی بە جەوهەری دنیا دەدات، بەڵام مەقامبێژێکی عێراقی لە لێواری بەجێهێشتنی هەموو شتەکاندایە، هەردەم لە سێبەری یادەوەرییەکانیدا دەنگ هەڵدەبڕێ، هاواری بریتییە لە ئەنجامی

هاوكێشەی ئامادەكارییەكانی خواحافیزیكردن لە هەموو شتێك: لە یارەكانی، لە مووی قەترانی، لە ددانی ساغ و خەوتنی زۆر. دنیابینی مەقامبێژ، ڕوانینی باڵندەیە كە هیچ پانتاییێكی سنووردار ڕازی ناكا، مەقامبێژ دەزانێ دنیا تەنها ئەو كەسانەی لێ ناژی كە كەروێشك بەخێو دەكەن، بەو مانایەی تەمەن ئەو بەرائەت و گەشبینییەی لێ دەسێنێتەوە كە پێی وابێ خۆی مەركەزی كەونە و گەر ئەو نەبێ دنیا دەوەستێت، دەزانێ پاش ئەویش كچی جوان هەراش دەبن و جوانی و ناهەقییەكان بەردەوام دەبن! ئەم دوو دنیابینییە بە قسەی كۆڵن ویلسون جیاوازیی نێوان تەماشای كرم و باڵندەیە، كرم تەنیا ئەو چەند سانتیمەترەی پێش خۆی دەبینێ، كەچی باڵندە گاڵتەی بەو پانتاییە دێت، ئەم دوو دنیابینییە وەك چۆن لە هەموو بوارەكانی ژیاندا هەیە، لە شیعریشدا بەرچاو دەكەوێت. لە شیعری تازەی كوردیدا كەسانێك هەن لە كەناری دەریای شیعردا قەفێك پانتۆڵیان هەڵكردووە و لە گرتنی نەهەنگە زەبەلاحەكانی ئەفراندنەوە دوورن، بە تەنكە ئاو ڕازین، ڕازی گەوهەرەكانی قووڵایی نازانن، ئەوەی كە ئارتۆر ڕامبۆ هاواری لێ دەكا (دەی ئەی نەفسی ئازیزم: بەرەو دەریا، بەرەو دەریا بەرەو قووڵایی دەریا)..



منداڵە شەرواڵ مۆرەکەی دیالە

کــورد نــووســـەری نــیــیــە!

(لە گونـــدێكی خـــوار دیـــالە، لەو گەرمەســـێرە، لەتەك دارخورماكـــان، لە نزیـــك بێســـتانی درەخـــتە بەرترشـــەكان، داربەڕووێـك ڕوواوە، بەرزییەكەی دوانـزە بسـت و نیـوە، ببـوە نیشانەی پرسیاری خەڵك.. ئەو داربەڕووە لەوێ چی دەكا؟ دواتر زانیمان: لەژێـر دارەكەدا خێزانێـك ئەنفـال كـراوە و نێـژراون، لە ناویاندا منداڵێكی شـەش سـاڵان هەبـووە و لە گیرفـانی شـەڕواڵە مۆرەكەیدا چوار بەڕوو هەبووە!).

زۆربەمان ماركیز دەناسین، لە نـۆڤلێتی (شـوێنەواری خوێنـت لەسـەر بەفـر)دا كچێـك لە ئـاهەنگی گواسـتنەوەیدا یەكێـك لە میوانەكـان چەپكەگـوڵێكی پێشـكەش دەكـا، دڕكـی گوڵێـك پەنجەیەكـی برینـدار دەكـا، لەگەڵ هاوسـەرەكەیدا بە ئۆتۆمبێـل دەچـنە پـاریس، لە ڕێـگەدا ئەو پەنـجەیەی هەر خـوێنی لێـدێ، دەیمژێ، لە پەنجەرەی سەیارەكەوە دەستی دەردێنـێ و پەنـجەی دەخاتە بەر هەوای ساردەوە، بە كلێـنس دەیبەسـتێتەوە و خـوێن هەر ناوەستێ، تـا دواتـر لە یەكێـك لە خەستەخانەكانی پاریسـدا جوانەمەرگ دەبێ، ئەمە ماركیز و دڵۆپەخوێنێـك، ئەمە ڕۆمـان و یەك دڵۆپەخـوێن، ئەی ئەو ڕووبـارە خـوێنەی لە مرۆڤـی كـورد ڕژاوە؟ كـــوا ڕۆمانەكـــانی؟! كـــوا شـــانۆگەرییەكانی؟! كـــوا فیلمەكانی؟! كوا شیعرەكانی؟! ئەو هەموو خوێنە بێجگە لە چەنـد

فەردە شیعرێکی عاتیفی و ڕووکەشانە چی لێ بەرهەم هات؟!
ئەو هەموو خوێنە بێجگە لە چەند شانۆگەرییەك لەبارەی نیرۆن و کالیگۆلای مامی و عوقدەی ئۆدیب بترازێ، شانۆگەرییەکی سەرکەوتووی لێ بەرهەم هات؟! ئەو هەموو خوێنە بۆ کەس نەیکردە تێکستێکی زیندوو؟! کێ کردییە گوتاری بێ مانا و خستییە ناو مۆنتاربۆی سیاسییەکانەوە؟! کەس نەبوو ئەو هەموو خوێنە بخاتە ناو دەقێکی ناوازەوە، پێش ئەوەی ببێتە فەقەرییەك لە بودجەی گشتی بۆ پاقلاوەخواردن و زەماوەندی یادکردنەوەی مەرگەساتەکان؟!

ئەدەبی کوردی هەر دەمەی لە پەنا شتێکدا خۆی دەشارێتەوە، لە پەنا ژنێك کە هەردەم لەوە دەسڵەمینەوە پێش هەموو شتێك بە ئینسانی بزانین، لە پەنا ئەو نیشتیمانە بێ غەلوغەشەی تیایدا هەموومان پاڵەوانین، لە پەنا مێژوو: ئەو مێژووەی کە قەت عەقڵ هەماهەنگی لەگەڵدا نەکردووە، مێژووی شێتیمان، چونکە کاتێ عەقڵ نابێ، شێتی هەیە، گەر ڕۆژئاواییەکان ڕێنیسانس بە هەماهەنگیی نێوان عەقڵ و مێژوو بزانن، مافی خۆمانە بپرسین کەی عەقڵ لەگەڵ مێژوومان، چ کاتێك عەقڵ لەگەڵ کۆمەڵگامان هەماهەنگ بووە؟ پێکەنینەکە لەوەدایە کورد هەمیشە ویستوویەتی لە ڕێگەی ئەدەبەوە (کە کۆڵەگەکەی خەیاڵە) باس لە زەروورەتی بوونی عەقڵ بکا!

لەوەش سەیرتر ئەوەیە ئەدەبی کوردی لە پەنا وەڵامەکانەوە خۆی دەشاریتەوە، ئێستاش پێی وایە گەر لایەکی وڵاتەکەی ئاو بوایە، ئەوا دەبووە خاوەنی شاعیری باش و حیکمەت و ئەدەبیات! دەبووە خاوەنی تێکست و داهێنان، دەبووە خاوەنی بەها و جوانی.

چۆنت بپارێزین؟! چۆن دەکرێ نەتەوەیەکی گەورە و گران، نەتەوەیەك خاوەنی هەزاران شاعیر و هونەرمەند بێت و چیرۆکی بەرووەکانی منداڵە کوردەکەی دیالەی پێ نەکرێتە دەقێکی زیندوو؟! چۆن دەکرێ لە سەدەی بیست و یەکدا بە قەد مەلا خدری نالیمان پێ نەکرێ، کە سەدە و نیوێك بەر لە ئێستا گوێدرێژەکەی زیندوو هێشتووەتەوە؟! لەگەڵ ئەوەی کە کەرەکەی نالی نە ئەنفال کراوە و نە هیچ. لەگەڵ ئەوەی کەرەکەی نالی **(کەللە وەك جەرەی شەرابی پڕ نەشات و تەڕ تەماغ، شێری نەڕ ئاهویی بەڕ گورگی سەفەر قەمچی نەچێژ)** بووە، نە قوربانی بووە و نە هیچ.

جا ئێمە چین تا بتپارێزین؟!

لە توخمەکانی بوون بتپارێزین: ئاو، ئاگر، خۆڵ، هەوا.

تۆ، بەو دەمە پڕ لە غوبارەوە، چیت داوە لە شکۆمەندییە ساختەکانی مێژوو؟

تۆ، بەو چاوە پڕ لە خومارەوە، فێرمان دەکەیت تەماشا

یەکسان نییە بە بینین.

بیرکردنەوە یەکسان نییە بە نووسین.

نووسین یەکسان نییە بە ئەبجەدییەت.

ئەبجەدییەت یەکسان نییە بە کوردبوون:

بەڵکوو یەکسانە بە بەڕوو.



# ئەدەب گرفتە یان چارەسەر؟!

گرفتی مێژوویی شاعیرانی کورد بە درێژایی مێژووی ئەدەبیاتی ئێمە ئەوە بووە کە شاعیرانمان پێش ئەوەی بە شوێن جوانیدا گەڕابن، بە شوێن هەقدا گەڕاون، واتا شیعری ئێمە هێندەی دووانەی هەق بووە، دووانەی جوانی نەبووە، گەڕان بە دوای هەقدا لە ئەنجامدا لایەنگیر و دوژمن بەرهەم دێنێت، خودی هەق مەسەلەیەکی ڕێژەییە و ئەوەی لای تۆ هەقە، مەرج نییە لای من هەق بێت و پێچەوانەکەیشی ڕاستە. ئێمە تەنیا مەگەر نالیمان هەبێت کە بە شوێن جوانییەوە گەڕاوە، بۆیە دەبینین هەمیشە درەوشاوەیە، بۆیە خوێنەری دەقی ئێمە لە نێوان لایەنگیری و دوژمنایەتیدا قەتیس کراوە، باشە بۆچی شەکسپیر ئامادەگی هەیە لەناو هەموو سەردەمەکاندا، لەناو هەموو کولتوورەکاندا؟ بۆچی تاوەکو ئێستا هیچ ئاراستەیەکی فیکری و ئایدۆلۆژی نەیتوانیوە لە بەرانبەر دەقەکانیدا بڵێت لەل؟ لەبەر ئەوەی هەموو خوێنەرەکانی شەکسپیر خۆیان تێدا دەدۆزنەوە، گەر شەکسپیر بە شوێن سەلماندنی ڕاستی و ڕەوایی فکرێك، یان فەلسەفەیەك، یان ئایدۆلۆژیایەك بوایە، ئەوا خوێنەرەکانیشی لە هەڵگر و هەوادارانی ئەو فەلسەفە و ئایدۆلۆژیایەدا قەتیس دەما. بە ڕای من ئەو کاتەش دەتوانین ڕێز لە بەهاکانی خوێنەر بگرین، ئەو کاتەی دەبنە بەشدار و شەریکە بەشی نووسین، ئەو کاتەی نووسەران دەست لە ڕۆڵی تەربیە و تەعلیم هەڵدەگرن و خۆشیان دەبنەوە بە خوێنەر. بە ڕاشکاوی دەڵێم کە لای ئێمە فاشییەتی مەعریفە هەیە، چۆن مەلایەك بە زانستی غەیبەوە دەنازێت، چۆن دکتۆرێك بە زانینی ئایندەی جەستەی

مرۆڤێکەوە دەنازێت، چۆن سیاسییەك وا دەنوێنێت کە دوارۆژی مرۆڤایەتی ناسیوە، ئاواش شاعیرانی کورد لە کەشکەڵانی فەلەکەوە لە ئاستی خوێنەر و وەرگری دەقەکانیان ڕوانیوە، لێرەوە نووسەران بۆ گێڕانەوەی متمانەی خوێنەرەکانیان، بەر لە هەموو شتێك دەبێت خۆیان ببنەوە بە خوێنەر.

نیو سەدە دەبێ و زیاتریش، پێنج دەیەی ڕەبەقە و زیاتریش: شیعری کوردی هێندەی وەڵامەکان دەنووسێتەوە، کەمتر پرسیار و گومان دەنێتەوە، وەك ئەوەی وشەکان و شتەکان بیانەوێ و نەیانەوێ ناچار بن لە سێبەری سپی کاغەزدا و لە پەنای پەمەییەکانی پەیامدا قاچ ڕاکێشن، شیعری کوردی لە پێنج دەیەی ڕابردوودا لەسەر دەستی نەتەوەیی و نێونەتەوییەکانەوە شیعری کۆمەڵگە و نەتەوە بووە و کەمتر شیعری ئینسان بووە، هێندەی شیعری ڕیزبوونی خەڵك بووە لە پشت پەیامێکەوە، نیو ئەوەندە پۆرترێت و ڕوخساری ئینسانەکانی نەکێشاوە، ئەم هاوکێشەیەش شیعر و سیاسەتی وەك یەك لێ کردووە (لە مانا قووڵەکەیدا)، چونکە لای ئێمە سیاسەت هەمیشە و بەردەوام خاوەنی گوتارێکی گشتگیر و دەستەجەمعانە بووە، بەردەوام هەموو پرۆژەکانی فەردانییەتی لە پێناو ئامانجە دەستەجەمعییەکاندا تواندۆتەوە، سیاسەت نایەتە سەر وردەکارییەکانی ئینسانێك، نایەتە سەر دیتێڵی گرفت و ئومێدەکانی ئینسان، هێندەی کار لەسەر ئەنجیلکردنی ئومێدەکان دەکات و گرفتەکان زەق دەکاتەوە، سیاسەت لای ئێمە دیارترین کایەکانی دەسکەوتنی وەڵام بووە، هەر بۆیەشە

شیعریش هەڵگری هەمان پەیامی وەڵامبەخشین بووە، بۆیەشە دەبینین لە ئێستادا یەك سیاسی نادۆزیتەوە شیعری هاوچەرخی کوردی پێ هەزم بکرێت (من یەك بە خۆم نەمزانیوە و نەمدیوە)، چونکە شیعری هاوچەرخی کوردی، شیعری گومان و پرسیارە (هەر چەندە پرسیار و گومانەکان سادە و ناکاملیش بێنە بەرچاو)، شیعری هاوچەرخی کوردی لە ئێستادا لەژێر تاعەت و فەرمانی سیاسەت نەماوە، وەکو جاران کۆمەڵگە و نەتەوەی بۆ تەیار و ئامادە ناکا تا بکرێتە سووتەمەنی وەهمە دەستەجەمعییەکان و سەرابی ئایدۆلۆژیاکان، لە ئێستادا شیعری کوردی ئەو کارە ناشرینەی نەماوە سەرجەم ڕەنگەکانی مرۆڤەکان بخاتە ئینجانەیەك و لەسەر سینییەکی زیو لەبەردەم سیاسەت و سیاسییەکانی دابنێت، ئەمەیە ئەو خاڵە ڕۆشنەی هەنووکە وێڕای کەمئەزموونی، شیعری هاوچەرخی پێ دەناسرێتەوە، بەڵام خاڵی هەرە ڕۆشنی ئەو ئاراستەیە تەنیا ئەوە نییە، بەڵکو بریتییە لەوەی کە شیعر ئیتر ناسنامە لەخۆیەوە وەردەگرێت، هەر ئەمەشە شیعری زیندوو دێنێتە کایەوە، ئەو ناسنامەیە وا دەکات ئۆکتافیۆ پاز مەکسیکییەك و کوردستانییەك و کەمبۆدیەك خۆشیان بوێت، وا دەکات لۆرکا ببێتە مولکی هەموو مرۆڤەکان (بە جیاوازیی نەتەوە و ڕەگەزەکانیانەوە).

سیاسییەکانی ئێمە، بەردەوام وا مامەڵەیان لەگەڵ شیعر کردووە کە جۆرێکە لە چارەسەر، لە کاتێکدا ئەدەب بە گشتی و شیعر بە تایبەتی: جۆرێکە لە گرفت. زمان خۆی هەڵگری پەتایە، لای ئێمە وەك دەرمان سەیر کراوە، بە داخەوە ئەوەی

سێرڤانتس لە (دۆن کیخۆتە)دا کردوویەتی تا ئێستا ئێمە پێمان نەکراوە، کە بریتییە لە شکاندنی وێنا و چەمکی پاڵەوان لە کەسی کوردیدا.

له شیعری نوێی کوردیدا جێگەی ئەوە نەماوە حەشر و قیامەت تێکەڵ بکرێت، تابووت و خوێن و دوژمن بخرێتە ڕستەی ئاڵۆزەوە، شیاوە مانا ئاڵۆز بێت، بەڵام مەرجە دارشتن ڕوون بێت، نالی بە دارشتنی ڕوون، ئاڵۆزترین و وردترین هەست و دنیابینی خستۆتەڕوو، شەکسپیر هەروەها، موتەنەبی هەروەها، چونکە یەکەمین ئەرکی زمان: گەیاندنە، شیعری ئێستا شیعری کۆسمۆپۆلیتی نییە، شاعیر وەك جاران بەرپرس نییە زەنگ بۆ ڕووداوە کەونییەکان لێ بدا، لە سەقافەی گشتی بەرپرسیار بێت، شاعیر شاعیرە و بەڕێوبەری شارەوانیش بەڕێوبەری شارەوانی، هەر کەسە و کاری خۆی، ئەو زەمانە ڕۆیی شیعر شوێنی میتۆدەکان بگرێتەوە، میتۆدەکانی لێ بار بکرێت، حاجی قادری کۆیی لەو کاتەی شاعیر بوو ناچار بوو میتۆدی مێژووش لە شیعرەکانیدا بار بکات و ببێتە مێژوونووسیش، ئەحمەدی خانی وێڕای شیعر دەبوایە جێگەی میتۆدی بیری نەتەوەییش لە مەم و زیندا بکاتەوە، فایەق بێکەس، حاجی تۆفیقی پیرەمێرد، دیلان، کامەران موکری، کێی تر؟ جا کێی تر نا؟ هەموویان وێڕای شاعیربوون دەبوایە تویژەری کۆمەڵایەتی و سیاسی و مەوعیزەدەر بن، شاعیرانی کورد زۆربەیان شیعریان بۆ شیعر نەنووسیوە، ئامانجیان شیعرییەت نەبووە، بەڵکو هەردەم (جا ناچار بووبن یان نا) شیعریان کردۆتە ئامرازێك بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی گشتی، بۆ ئەمەش هۆکار زۆرە، ڕەنگە بڵێین جا ئەم کارە مەزن نەبووە؟ بەڵێ منیش دەڵێم مەزن بووە، بەڵام بۆ شیعر نا، بۆ هەموو بوارەکانی ژیانی کورد کارێکی ئێجگار مەزن

بـووە، بـێجگە لە بەرهەمهێنـانی شـیعرییەت. لێـرەدا نـاچمە نـاو وردەکارییەکـانەوە چـونکە دەگەیـنە ئەوەی بپرسـین ئـاخۆ ئـێمە مێژووی ئەدەبمان هەیە، یـان مێـژووی ئەدیبانمـان هەیە؟ چـونکە مەرج نییە هەر کاتێك ئەدیب هەبوو، ئەدەب هەبێ. بۆ نموونە لە دەیەی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو دەیـان شـاعیرت هەیە، بەڵام بە دەگـمەن شـیعرت دەسـت دەکەوێ. گەر وردتـر بـدوێین لەبارەی نووسینەوەی ئـاڵۆزی بە زمـانێکی سـادە، ئـاوا ناچـارم بە کـورتیش بـێ ئامـاژە بە گرفتێکـی دیـاری شـیعری هـاوچەرخی کوردی بدەم، یەکێك لە کـۆڵەگە سـەرەکییەکانی شیعر لادانـی زمانەوانییە، ئەوەی جان کۆهین ناوی دەنێت (خلیسکانی زمـان)، بەو واتایەی لە شیعردا دەتوانیت یاسا و ڕێسـاکانی قسـە و زمـان بشـکێنیت، ئەمەش بـۆ ئەوە بـووە کە سەرسـوڕمان و ئینبیهـاری زمانەوانی لە تێکسـتدا فەراهەم بکرێـت، یـان پەیوەنـدیی تـازەی زمانەوانی بدۆزیتەوە، بۆ نموونە شیاوە لە شیعردا بڵێیت (شەوم فڕ کـرد) یـان (شـاخم خـواردەوە و تـاد) کە ئەمە لادانە لە یاسـا و ڕێسـای قسـە (کـلام) و زمـان (اللغـة)، لە شـیعری هـاوچەرخی کوردیـدا لادانەکـان و خلیسـکانەکای زمـان لە شـیعردا هێنـدە دووبـارە و هەزاربـارە کـراونەتەوە تـا ڕادەیەك خۆیـان بـوونەتە بەشـێك لە یاسـا و ڕێسـای زمـان، واتـا چۆرێـك سەرسـوڕمان و ئینبیهاریـان لای خـوێنەر نەمـاوە، بـۆ دەرچـوون لەو گـرفتە و بەدەستهێنانەوەی متمانەی خوێنەر زۆر جار شاعیرانی ئێمە فێڵیـان کردووە، بۆ نمـوونە شـاعیرێك کە ناتوانێـت وێنەیەکـی نـوێ لە ڕێی پەیوەندیی نوێی وشەکانەوە دروست کا، دێـت فێـڵ دەکـا،

زمان و داڕشتنەکە هێندە ئاڵۆز دەکا تاوەکو ئۆپشنەکانی خوێنەر نەهێڵێت و ئەگەرەکانی ڕەتکردنەوە یان قبوولکردن لە خوێنەر بسەنێتەوە، جاریش بووە فێڵی دیکە لە خوێنەر کراوە، بۆ نموونە کە شاعیرێك ناتوانێت سیاقێکی نوێ و چێژبەخش بداتە وشەی (خۆرهەڵات) و یەکسەر دەیکاتە (شروق) یان سپێدە دەکا بە (فەجر) یان (کەو) دەکا بە (نەورەس) و تاد.. بەو وەهمەی کە خوێنەر لەو خۆدزینەوەی شاعیر نەگات و سەرسوڕمانی بۆ فەراهەم بێت. ئەم ڕێگایانە هەموویان یەکسانن بە شێلوکردنی ئەو ئاوە تەنکانەی کە قووڵی بە خوێنەر دەفرۆشنەوە. نەوەی نوێ پێویستە تەنیا لە ڕێگەی خوێندنەوەی شیعرەکانی عەبدوڵلا گۆران وانەیەك وەرگرێت لە بەکاربردنی زمان، گۆران لە زۆربەی شیعرەکانی بەبێ ئەوەی وشە بخزێنێ و زمان تێك بدا شیعریەتی بەرهەم هێناوە (کە یەك بە خۆم و بەو چاودێرییە سادەیەمەوە تا ئێستا نەمزانیوە لە زمانەکانی دیکەیش کاری ئەدەبی لەو شێوەیەی گۆران کرابێت) بە زمانی ئاسایی و بەبێ تێکشکاندنی یەك مانـاوە شیعر بنووسرێت و شیعریەتێکی ناوازەیشی هەبێت، کاتێ گۆران دەڵـێ (بە ئاسمانەوە ئەستێرەم دیوە) یان (جادە چۆڵ و سێبەر بوو کاتی بەیانی) و چەندان تێکستی دیکەیش، بەبێ بەکاربردنی فێڵەکانی دەسکەوتنی شیعریەت توانیویەتی ناوازەترین و ناسکترین شیعر بنووسێت، بەبێ ئەوەی هەر پێویستی بە یارییە زمانەوانییەکان بێت و خۆی لە پەنا ئەو یارییانە بشارێتەوە جوانترین دەقی پێشکەش کردوین، پێم وایە ئەوە گۆرانە و بەس کە کتێبە بەنرخەکەی (بونیادی

زمانی شیعری)ی جان کۆهینی بە درۆ خستۆتەوە کە شیعر تەنیا دەبێ لە ڕێی تێکشکاندنی زمانەوە شیعریەت بینێتە کایەوە، لێرەوەیە لەسەر هەمووومان پێویستە ئەو وانەیەی گۆران بە هەند وەرگرین.



# ئەنگوستیلەی ئەدەب و
# ڕاوەمـاسـیـی سـیـاسـەت

(١)

نووسین و بڵاوکردنەوە بۆ میللەتانی تر تۆمارکردنی ئامادەگی بووە، تەنیا لای کورد ڕاگەیاندنی نادیاریی بـووە. چ قەدەرێکـی ئەدەبیانەیە: بڵاوکردنەوە یەکسان بێت بە غیاب.

(٢)

بەڵێ
ئەم سەردەمە لە جاران جیاوازترە
جەللادی زۆر و قوربانی زۆرتر.
شاعیری زۆر و شیعری کەمتر.

(٣)

مێژوو نا
هیچ لەوحێکی سەهۆڵیش نییە
بەشی نووسینەوەی ئەو هەموو ناوە بکا
کە شوێنێکیان لەم جیهانەدا پێ نەبڕا.

(٤)

ئای
بە ناوی ئەوەی، برین گەورەترە لە دەنگ
ئەدەب ناچار دەکرێ ببێتە لم
لە نێوان

ئاوی ستایشی زیندووان و
سەرابی گلەیی لە مردووان.

(٥)

لەو هەموو مردنەدا
پاکترین بێشکە، ئەمینترین تابووت
بۆ ئەو کۆرپەیە بوو
لەناو سکی دایکیدا
لە شەنگالدا، لە برسا مرد.

(٦)

لە شەڕی منداڵەکاندا
ئیرەیی بە جنێوێك دەبەم
(دەتنێرمەوە ئەو شوێنەی لێیەوەی هاتووی)
ئای.. سکی دایکمان
لە دوای ئەم گەشتە دژوارەی دنیا
لە ئیسراحەتی گەیشتنەوە ماڵ دەچێت.

(٧)

ئەو، بیر لە کونەڕەشەکانی ئەنیشتاین دەکاتەوە
منداڵەکەیش لە نەبوونی کارەبا
وەك ئەوەی ئەم زەمەنە
هەر تاریکی لێ بوەشێتەوە.

(٨)

ئەدەب بە شوێن ئەنگوستیلەوە دەگەڕێ و
شەڕ هەموو ماسییەکانی برژاند
شاعیر بە شوێن هێلکەی زێڕینەوە عەوداڵە و
سیاسەت هەموو جووجکەکانی خستە فڕنەوە.

لەگەڵ هاتنەکایەوەی هەر قەیرانێکی سیاسیدا، دەیان و سەدان دەنگ دەبیستین کە بیری شیعری بەرگری دەکەن و دەنووسن و دەڵێن (زۆر پێویستیمان بە ئەدەبی بەرگری هەیە)، هەندێکیان گرفتەکە دەکەنە شەخسی و دەنووسن و دەڵێن (ئای.. مامۆستا شێرکۆ بێکەس چەند زوو جێت هێشتین؟) هەندێکیشیان تەماهی لەگەڵ دێڕ و کۆپلەی شیعری حەفتاکانی سەدەی ڕابردووی (عەبدوڵلا پەشێو و لەتیف هەڵمەت)دا دەکەن و لە واڵ و پەیجەکاندا بڵاوی دەکەنەوە و دەیخەنە ناو چوارچێوەی تەلبەندکراوەوە، کە لەسەریەوە جامانەیەکی خوێناوی دەشەکێتەوە. ئەم قسانە بۆ ژانرەکانی دیکەی ئەدەب و هونەریش ڕاستن، لێرەوە ئەو تابلۆیانە بازاڕ پەیدا دەکەن کە کۆتری باڵ بریندار و پۆستاڵیان تێدایە، ئەو شانۆگەرییانە دێنە سەر تەختە کە باس لە نەبەردی و مەردایەتی مەخلووقێکی بەستەزمان دەکەن کە ناوی ئینسانە. لەم جۆرە فەزا قەیراناویانەدا تەنیا ئەو ئەدیب و هونەرمەندانە زەرەر دەکەن کە باوەڕیان بە کردنەوەی ئاسۆی نوێ هەیە، نەك ڕەنگدانەوەی واقیعێکی ڕزیو. ئەوانەی سوودمەندیش دەبن ئەو ئەدیب و هونەرمەندانەن کە ئەدەب و هونەرەکانیان لەژێر تایتڵی پیرۆزەوە دەشارنەوە، پیرۆزیی لە نادیار و ئاییندەوە نایەت (کە دیدگای ئەدەب و هونەرە)، بەڵکو لە دیار و ڕابردووەوە دێت (کە دیدگای ئایین و سیاسەتە). بۆیە هەمیشە شیعرە بەرگرییەکانی مامۆستا شێرکۆ بێکەس و پەشێو و هەڵمەت و هتد.. بیانەوێ و نەیانەوێ، بە ئەنقەست بووبێت یان

نـا، جـۆگەلە بـوون و لە ئەخیـردا چـوونەتەوە نـاو ڕووبـاری سیاسەتەوە، ئەوە ئەگەر نەشچووبنەوە نـاو مەسـبەحی مەزرەعەی سیاسییەکانەوە. لێـرەوە چەنـدان ئەدیـب و هونەرمەنـد دەناسـم لە کاتی قەیرانـدا دەبـێ بێـدەنگ بـن و نە کـۆڕ سـاز دەکەن و نە پێشـەنگا دەکەنەوە و نە شـانۆ نمـایش دەکەن، چـونکە بـازاڕی میـــدیاکان و تۆڕەکـــانی پەیوەنـــدی بە پیـــاوانی قۆنـــاغە هەستیارەکانیان نابینن، لە ڕاستیشدا ئەوان ئەدیـب و هونەرمەنـدی ڕاسـتەقینەی ئەو نەتەوەیەن و نەبـوونەتە بەشـێك لە مەجهـودی حەربـی. دیـدگا و ڕوانـگەی هـونەر و ئەدەبیـات پەیوەنـدی بە بیرۆکەی سـوودبەخش نییە، جـا سـوودبەخش بـۆ کـێ؟ سـەیرە ئەدیب و هونەرمەند هەبن باوەڕیان بە شەڕ و ئاشووب هەبێت بۆ گەیشـتن بە خۆشـگوزەرانی؟ ئەدەب و هـونەر مێـژوو دروسـت دەکەن، نەك دۆکیۆمێنت بن لەبارەی مێژووەوە. واقیـع دەگـۆڕن، تێی دەپەڕێنن، نەك ڕەنگدانەوەی واقیع بن و کاوێژی بکەنەوە.

ئەدەب و هـونەر، ئەدیـب و هونەرمەنـد دژی شـەپۆلە بـاو و چەسـپاوەکانی کـۆمەڵگە و نەتەوە مەلە دەکەن، نەك لە تەنیشـت هێزە چەکدارەکانەوە ببنە سەوڵ لێدەری کەشتییە شڕوشـەقەکەی هزر و دنیابینیی تەقلیـدی و زانراوەکـانی سیاسـەت و ئایـدۆلۆژیا کە کـاپتنێکی سیاســی بەرەو کەنارەکــانی بەرژەوەنــدی لێــی دەخوڕێ. لێـرەوە دەبینـین لە قەیرانەکانـدا کەس کـاری بە نـالی نیـیە، کەس کـاری بە مۆسـیقا نیـیە، کەس کـاری بە هـونەری جواناســەوە نیـــیە، هەموومـــان دەبیـــنە قوربـــانیی تـــایتڵی دەستەجەمعییەوە، وەك ئەوەی بەرگریکردنـی ئەدەب و هـونەر لە

ژیان و ئینسان، له جوانی و کرانەوەی دید و نەفس بەسەر نادیار و مەجهوولەوە، یەکسان نەبێت بە بەرگریکردن لە مانەوە و نەتەوە؟ خۆشاردنەوەی سیاسییەکان لەبەر سێبەری مانشێتی سەربەخۆیی و پیرۆزییەکان و شاردنەوەی فەشەلیان بەرانبەر ئینسان و باشترکردنی ژیانەوە لە ئەستۆی خۆیانە و لێیان دەوەشێتەوە، بەڵام بەرهەمهێنانی دەستەواژەکانی ئەدەب و هونەری لەرزۆك و خیانەتکار مایەی پێکەنینە، بێگومان کەسیش ناتوانێ قسەیەك بکات (وەك ئەوەی لە ئێستادا مارکس ببەیتە مزگەوتێکی مووسڵ و هاوار بکەیت خوا هەیە و ئیسلامیش هەقە، جا با بتوانێ قسە بکا!) لە کەیەوە سیاسی و سیاسەتی کوردی چاوقایمیی ئەوەی پەیدا کردووە بە ئەدەب و هونەر بڵێت: لەرزۆك؟ هەرچەند لێرەدا هەر ئەو لەرزۆکییە باشترە لە چەسپاو و زانراو، لەرزۆك کراوە و بەخشندەیە بەرانبەر بە سبە و ئاییندەوە، دەفرێ و نازانرێ لە کوێ دەنیشێتەوە. زانراو و چەسپاو لە قەبری ڕابردوو ڕاکشاوە، ئەگەرەکانی سووتاوە، جووڵەی کوژراوە.

ئەگەر سیاسەت ئامانجی گەیشتن بێت بە گشتپرسی ئیجابی، ئەوا کرۆکی داهێنان بریتییە لە ڕەخنە و ڕەتکردنەوە، ئەدەبی ڕازی و هونەری ڕەزامەند: بوونی نەبووە و نابێت، تەنیا لەو کۆمەڵگایانەدا نەبێت کە شمولیبوون و داپڵۆسێنەر بوون، حەفتا ساڵ و زیاتریش لە ئەدەبیات و هونەری ڕەسمیی یەکێتی سۆڤیەتدا بچووکترین کێشە نەدەبینرا، بەڵام ئەو ئەدەبیاتە ڕەسمییە ڕووکەش و موزەیەفە چووە ناو مەزبەلەی تەئریخەوە. ئەگەر

سیستەم و دەوڵەتداری چەسپاندن و پارێزگاری بێت لە واقیع و مێژوو، ئەدەب و هونەر شکاندن و تێپەڕاندنی ئەو واقیعەیە لە ڕێی جووڵە و زمانەوە، فەتحی مانا و دیدگەی نوێ بۆ کرانەوەی واقیع بەسەر ئەگەرەکاندا هیچی کەمتر نییە لە ناونیشانەکانی تر (جا سیاسی بن یان کۆمەڵایەتی)، چونکە ئەگەر سیاسەت بنازێت بە بنیادتنانەوە و جێگیرکردنی لایەنە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان، ئەوا ئەدەب و هونەر لە جووڵەی هەمیشەییدایە بۆ گۆڕینی لایەنە ئیستاتیکی و ڕووناکبیرییەکان.



## کۆکبوون لەبارەی جوانییەکانەوە
## هەڵوەستەیەك بۆ هەردی

نووسین لە بارەی ئەو کەسانەی کە کۆدەنگییەکی ئیجابییان لە یادەوەریی خەڵکدا هەیە، کارێکی ئەستەم و پڕ لێکدژییە، لەوانە شاعیری گەورە و مامۆستای ناودار **ئەحمەد هەردی** کە چەشنی چەند ناوێك لە مێژووماندا کۆدەنگییەکی پڕ لە جوانی و ڕێزی هەیە. کەس نییە بتوانێت نکۆڵی لە گەورەیی **پیرەمێرد** یاخود **ئیبراهیم ئەحمەد** یان **یونس دڵدار** بکات، ئەم ناوانە لە دەرەوەی داهێنانی ئەدەبیشیان بوونەتە بەشێك لە زاکیرەی نەتەوەیی و نیشتمانی، بۆیە هەر نووسینێك دەربارەیان دەبێت بەوپەڕی ئاگاییەوە بنووسرێت چونکە ئەو کەسانە تەنها لە سووری ئەدەبیدا نەماون بەڵکو بوونەتە بەشێك لەو سیمبۆلە نەتەوەییانەی کە تەواوی خەڵك بە هیی خۆیان دەزانن.

من لێرەدا ئەو چەند زانیارییە زانراوەی سەرەوە و ئەو پێشەکییە تەقلیدییەم (کە هیچ قسەیەکی تازەی منی تێدا نییە) بۆ ئەوە نووسی تا بڵێم مامۆستا هەردی لە ژیانی ئەدەبیی خۆیدا چەند وانەیەکی فێرکردووین کە دەکرێت لە دەرفەتێکی ئاوادا ئاماژەیان پێ بکرێت: یەکێك لە سەرەکیترین ئەو هێما ئەدەبییانەی مامۆستا هەردی بۆی جێ هێشتووین (کۆکبوونمانە لەسەر جوانییەکانی هەردی)، زۆرێك لە شاعیران بە چەند هۆکارێك جا شیعری بن یان بیروڕاکانیان لە دەرەوەی شیعر، بەشێك لە خوێنەرانییان لە دەست دەچێت! نموونەش زۆرن: لەوانە مستەفا بەگی کوردی و پەیوەندییەکانی لەگەڵ فەقێ قادر کە کەسانێك هەن (دوور لە شیعرەکانی) پێیان وایە لەسەر ئاستی کەسایەتی لەکەدار بووە (کە من لەوان نیم) و نەدەبووایە ناوی

له کـوردییەوە بگۆڕێـت بـۆ هیجـری، یـان عەبـدوڵڵا گـۆران و پەیوەندییەکانی لەگەڵ شیوعییەکانی سـەردەمەکەی! یـان نـالی و ئەو نەتەوەییانەی پێیانوایە لە بـری جەسـتەی مەسـتوورە پێویسـت بـوو مەرگەسـاتەکانی ئەوسـای کـوردی بکـردایە بە مەتەڵ! یـان عەبدوڵڵا پەشێو کە کەسانێك هەن لەگەڵ بۆچوونە سیاسییەکانیدا نین و چەندین نمـوونەی تـر. بەڵام کە قسـە دێـتە سـەر مامۆسـتا هەردی کـورد گـوتەنی ئـاو ڕادەوەسـتێت و هەمووسـان کـۆکین لەسەر جوانییەکانی، کۆکین لەسەر ئەوەی شیعرەکانی بەشێکە لە ئومێد و گرفتەکانمان، مامۆستا هەردی لەوە گەیشـتبوو کە شـیعر سـەکۆی بیـروڕا نیـیە، شـیعر نابێـت بکـرێتە مینـبەری بیـروڕا شەخسییەکان، لای ئەو شیعر هەم ئامراز و هەم ئامانجی جوانییە، چونکە گەر شیعر بکـرێتە سـەکۆی بیـروڕا ئەوە بـۆ خـوێنەر لە بابەتی چێژ دەردەچێت و دەبێتە دژایەتی یان لایەنگیری، شـاعیر هەیە کە شیعرێك بڵاو دەکاتەوە نیـوەی گەلـی کوردسـتان پێـی جوانە و نیوەی گەلـی کوردسـتان پێـی جـوان نییە! بە ڕای مـن سـەرکەوتوویی مامۆسـتا هەردی بـۆ ئەوە دەگەڕێـتەوە کە لە لە لایەکەوە لە تەوەرەکانی ئازادی و جوانی شیعری نووسـیوە و لە لایەکی دیکەوە کەمنووس بووە، شیعری زۆر و بـۆری نەبـووە، بـاوەڕی بەوە هەبـووە کە بەهـرە وەکـو برووسـکە وایە دێـت و دەڕوا، شـیعر لای ئەو کـۆتری مـاڵی نیـیە، ئـاژەڵێکی کێـوییە و دەستەمۆ ناکرێت، بێگومـان هەمـوو ئەو شـاعیرانەی گرەویـان لە مێژوو بـردووەتەوە ئەوانە بـوون کە ڕێزییـان لە بەهـرەی خۆیـان گرتووە و شیعرنووسـینیان نەکـردووەتە پیشـە، بەڵکـو ئەوکـاتەی

لەحزەی شیعرییەتیان نەبووە بەوپەڕی جورئەتەوە بێدەنگ بوون، نێوانی شاعیر و خوێنەر وەکو نێوانی دوو کەسی عاشقە، هەمیشە پێویستی بە نوێبوونەوە و تازەگەری هەیە، ئەو شاعیرانەی تازە نابنەوە لەگەڵ خوێنەرەکانیان و دەست لە نووسینیش هەڵناگرن لە گەورەترین نەهامەتیدا دەژین، بێدەنگبوون لەو کاتەی شاعیر هەست دەکات سنوورە ئیبداعییەکانی پێشووی نابەزێنێ جوانییەکە هەر لە مامۆستا هەردی دەوەشێتەوە، ئەو بێ منەتانە بە دیوانێکی بچووك (بەڵام پڕ بایەخ و کاریگەر) قەناعەت دێنێ و وانەیەك لە چەشنی ئارتور رامبۆ پێشکەش بەوانە دەکات کە شیعر لایان گەیشتۆتە سیفەتی برنج خواردن کە پێویستە مادامەکێ زیندووە پێویستە لە ژەمێك لە ژەمەکاندا هەبێت! نهێنیی شیعری باش لەوەدایە کە هەموو ئاراستە ئەدەبییەکان ئەو دەقە بە مولکی خۆیان دەزانن، ئەم دەستەواژەیە بۆ مامۆستا هەردی زۆر سوودبەخش بووە، بۆیە لە هەندێ شیعری هەردیدا دەبینین کە زەمەن دەرەقەتی بابەت و داڕشتنەکان نایەت، سەردەم لە دوای سەردەم ئەو شیعرانە توانای مانەوە و گەشانەوەی بەردەوامیان هەیە:

**لەسەر لووتکەی بڵندی گەنجی وەستاوم**
**شریتی عومری ڕابردوو وەکو خەو دێتە بەرچاوم**
**شریتی چی سەراسەر سەرگوزەشتەی نائومێدیمە**
**فیلمی پڕ لە ناسۆری هەرەسهێنانی لاویمە**

چ زەمەنێك دەتوانێت ئەم وێنانە بەرەو پیربوون و لەناوچوون

ببات؟ بۆچی هەموو خەڵك كۆك نەبن لەسەر جوانییەكانی مامۆستا هەردی؟ ئەم جۆرە شیعرانە كۆتریماڵی نین، بەڵكو ئەستێرەی گەشاوەی هەموو پارچەكانی ئاسمانن. مامۆستا هەردی وێڕای ئەوەی ماوەیەك سەرۆكی حزب بووە و ڕۆڵێكی دیاری سیاسی لە قۆناخێدا هەبووە، كەچی هەرگیز ئەو بیروڕا سیاسییانەی نەكردوونەتە ئامانجی شیعرەكانی. كەچی هەنووكە شاعیر هەیە هەموو ئومێدە شیعرییەكانی لای ڕازیكردنی حیزبە، كەچی دەڵێت حیزبی نیم! ڕاستە مامۆستا هەردی شیعری بۆ ئازادی نووسیوە، بەڵام كام ئازادی؟ ئەو ئازادییەی تێكەڵ بە پڕۆژەی لایەنێك نابێتەوە بەڵكو ئەو ئازادییەی كە بەشی هەمووانی تێدایە. چەند وانەیەكی بەسوودە كە مامۆستا هەردی پێشكەش بە ئەدیبانی دەكات، شاعیرێك سەرۆكی حزب بێت و بە شاعیری بمێنێتەوە! ئەوەی سەبووریمان دەدات ئەوەیە كە مامۆستا هەردی پێش ماڵئاواییكردنی هەستی بە خۆشەویستی و تەقدیری هەموومان دەكرد. شاعیری كورد لە زۆربەی جارەكاندا دوای مردنیان ڕێزیان لێ گیراوە.

بەڵام خۆشبەختانە هەردی لە ژیاندا بوو كە دەیزانی خەڵك چەند بەسۆزەوە لێی دەڕوانن، ڕاستە دیوانە تاقانەكەی "ڕازی تەنیایی"یە، بەڵام بە هەق ڕازی هەموومانە.

(١)

کاتێ کوردایەتی لای ئەدیبان بوو
قانع، بێکەس، هێمن، ئەسیری
کانییەکی ڕوون بوو.
کە هاتە لای سیاسییەکان
بووە ئاوێکی لیخن و
خستیانە ناو بوتڵەکانەوە و
بەناوی فرمێسکی دایکانەوە، کڕیمانەوە.

(٢)

هەموو ئاسۆکان بەرەو خوێن دەڕۆ
منداڵەکان بەرەو چاوشارکێی ئەبەدی
ڕاکردن لەو ماڵانەی دەرگا ناپەرستن، ئەستەمتر بووە
شیعریش ناچارە
شایەتیی بۆ باخچە بدا.

(٣)

ئەوەی لە شەڕدا دڵتەنگم دەکا
هەموو قسە مەجازییەکانی دایك بەتاڵ دەبنەوە و
بەسەر بەردی واقیعدا دەشکێن
کە بە منداڵەکانیان گوتبوو
ئێوە ئەستێرەن و فریشتە دەتانپارێزێ.

(٤)

بەزەیی مرۆڤ بۆ دنیا لەوەدایە: بێ پرسیارە.
بەزەیی دنیا بۆ مرۆڤ لەوەدایە: بێ وەڵامە.

(٥)

لەوەتەی هەین نەماپرسیوە چی ڕۆیشت؟
هەر دەپرسین کێ مایەوە؟

(٦)

ئادەم بە سێوێك بەهەشتی فرۆشت و دنیای کڕی
بۆ کڕینەوەی بەهەشت کەس نییە دنیامان لێ بکڕێتەوە؟!

(٧)

بە مانا بڵێ:
بە پەیژەی ئەم حەرفە سەقەتانەوە
بە دەزووی ئەم قسە چاوقایمانەوە
زمان، ناگاتە بەژنی زەمان.
ڕەوایش نییە مووەکانمان لە سپیبووندا
ئەو هەموو ڕەهەندە بدەنە سپێدە
شیاو نییە فرمێسکەکان
ئەو هەموو چەمکە بدەنە باران.

(٨)

تینوێتیمان بە چی بشکێ؟
دەستدرێژ کەین
دەماری جۆگەلەیەك لە کانی ڕاکێشین و هەڵیمژین؟
برسێتیمان بە چی بشکێ؟
واوی واقیع بکرۆژین
کامە بکەین، ئەوەی کە خەون دەیڵێت
یان سروشتی توخمەکان؟

(١)

ئەم کاروانە چەند ماندووە
لەژێر هەتاوی سووتێنەری ڕۆژگارێکدا ڕێ دەکا
خۆی پێویستی بە سێبەرە
بە تەمای بارانی هەورێکە
بیابانیش نایناسێتەوە.

(٢)

میوەی مەجلیسی زاڵمان
هێشتا ئەندامانی جەستەی ئێمەیە
چاوەکان بوونەتە هێشووە ترێ و
پەنجەکان بوونەتە ترۆزی ناسك و
لاجانگ و ڕوومەتەکان بوونەتە قۆخی تووکن
مەجلیسی ئاغاکانی تاریکی
ترسی منداڵیان کردۆتە لاوك و
لاواندنەوەی دایکان بە حەیران.

(٣)

سەیرە
ئێمە هەموو نەهامەتییەکانمان تاقی کردەوە
تەنیا نەهامەتیی زمان نەبێت
ئێستایش بە شوێن شکۆی زمانەوەین.

(٤)

ئێمە
لەگەڵ ئەوەی لە ژیاندا باجی کۆن دەدەین
مردنیشمان هی جارانە و
نوێگەریی تێدا نییە.

(٥)

نابێ ئەو دیدگایە ڕاست بێ کە مردووەکان دەبنە ئەستێرە
دەنا قوربانییەکانمان
دەیان ئاسمانی دیکەی پێویست بوو.

(٦)

کەسمان نەمانتوانی هەستین
بڕۆین بە پیر، پیرەمێردێکی کەنەفتەوە
قژی کچۆڵەیەکی ئاوارە شانە بکەین
نەمانتوانی ئاییندەی زمان فەرامۆش بکەین و
بڕۆین بە پیر هاواری ئێستاوە.
بشمانەوێ ناتوانین هەستین
چونکە مێژوو لە کۆشماندا دانیشتووە.

(٧)

نیشتیمان پڕە لە قسەی نەستەق و
بەتاڵە لە وڕێنەی زمان
بۆ ئەوەی بە تەواوی نەدۆڕێین

دەبێ پێچەوانەی بکەینەوە
پڕی بکەین لە وڕێنەی زمان و
بەتاڵی بکەینەوە لەم جۆرە حیکمەتانە.

(٨)

هەقە بە مردن بڵێین شتی نوێمان نیشان بدە
بە وردەبرینەوە مەمانترسێنە
پشتمان لە کووڕبوونەوەدا مەچوێنە بە چیاکان
نێوچەوانمان لە لۆچیدا مەچوێنە بە دەشتەکان
یەکجارەکی هەڵمەت بێنە ئەی ترسنۆك.

(٩)

چەندین سەدەیە وەك مێرووله
دەڕژێینە پەرستگاکان و
سەرقاڵی تەونی دوعا و نزانەوەین
بۆ دروستکردنی لێفەیەك بمانپارێزێ لە سەرمای دنیا
کەچی دەرچوو
تەون و چنینەوەی عەبایەکی ڕەش بوو
بۆ خەلیفەی نەینەوا.





# مردنی نووسەر
# لەدایکبوونی خوێنەر

تیـزی "مردنـی نووســەر" لای فەیلەســووف و ڕەخنەگــری ناسراوی فەڕەنسی ڕۆلان بـارت (١٩١٥-١٩٨٠ز)، بـۆ ئەدەبیـاتی کوردی سوودێکی زۆری دەبێت، بـارت لەم تێزەیـدا بـاس لەوە دەکـات ئەو سـاتەی خـوێنەر تێکسـتێک دەخـوێنێتەوە، دەبێـت نووســەرەکە لە زەینیـدا نەمێنێـت و خـوێنەر خـۆی دەبێـتەوە بە نووسەری تێکستەکە.

بێگومان "مردنی نووسەر" تەنها لەو تێکستانەدا بەدی دەکرێت کە هیچ جۆرە لایەنگیرییەکی نووسـەر نـابینین، لە هەمـان باسـدا ڕۆلان بـارت لە "پـلەی سـفری نووسـین"دا پێـی وایە، تێکسـتی ناوازە ئەو تێکستەیە کە تیایدا نووسـەر بەبـێ زیـاد و کەم، بەبـێ سالیب و موجەب لە زەینی خوێنەردا دەکشێتەوە، واتـا نووسـەر بیروبۆچـوونی تاکەکەسـیانەی خـۆی، ئایـدۆلۆژیای، دنیـابینیی خۆی بەسەر خوێنەردا فەرز ناکا.

دنیـای هـاوچەرخ بە هـۆی پێشـکەوتنی تاکەکـان و فرەیـی سـەرچاوەی زانیــاری وەرگــران، دنیــای نەمــانی ســەرمایە ڕەمزییەکـانە، لەدنیـای ئێسـتادا وەک چـۆن سیاسـییەکان پیـرۆز نەماون، وەک چۆن شێخەکان موریـدییان کەم بـووەتەوە، وەک چۆن دکتۆر و حاکم و ئاغاکان جاری جاران نییە تەنها سـەریان بۆ ڕاوەشێندرێت، ئاواش نووسەر و شاعیرەکان بوونەتەوە مرۆڤی ئاسایی و داماڵراون لەو سەرمایە ڕەمزییەی جاران بە هۆی ئیلهـام و پەیوەندیی ڕۆحییان بە وەحیوەرگرتن خۆیان پێ بـادەدا. ئێسـتا مێردمنداڵێک بە هۆی ئامرازەکانی پەیوەندییەوە ئامادە نییە وەکـو

ئەو جووتیارانەی قانعی شاعیر شیعری بۆ دەخوێندنەوە: تەنها سەر بلەقێنن، بەڵکو مێردمنداڵەکە دەتوانێ و مافی خۆشیەتی و ئامرازیشی لەبەردەستدایە بەشداری و قسەوباس و کۆمێنتی لەسەر تێکست و ڕەهەندەکانی هەبێت، جاران پەیامی شاعیران فیدباکی نەبوو، شاعیر نەیدەتوانی کاردانەوەی خوێنەرەکانی بزانێت، بەڵام لە ئێستادا هەمان چرکەی بڵاوکردنەوەی دەقەکەی، کاردانەوەکان پەیدا دەبن، ئەو سەرمایە ڕەمزییەی لە جاراندا بۆ نووسەران و شاعیران فەراهەم کرابوو، کە تیایدا نووسەر لە کتێبەکەیدا کێشە و گرفتە شەخسییەکانی خۆی لەگەڵ خەڵک و جیهان بەیان دەکرد، ئێستا گەر خوێنەر هەست نەکات تێکستەکان ڕەنگدانەوەی شتگەلێکن کە خۆی بە خاوەنییان بزانێت، ئەوا لەو نووسەرە دەتۆرێ، دەیان و سەدان و هەزاران نووسەری دیکە هەن کە بێ ماندووبوون بەرهەمەکانیان دێنە بەر دیدەی.

هەندێک لە نووسەر و شاعیرە کوردەکان، بۆ شاردنەوەی شکستەکەیان بەرامبەر خوێنەر، ناو و ناتۆرەی نەخوێندەواری، تێنەگەیشتن لە وەرگر و خوێنەرەکانیان دەنێن! ڕاستییەکەی بڕوام وایە ئینسانی کورد لە هیچ شتێک نەگا لە شیعر و ئەدەبیات تێدەگات، ئینسانی کورد هەر خۆی بوونەوەرێکی شیعرییە، کورد بەشداری ئەوتۆی لە زانست و ئابووری و ئارشستانییەتەکاندا نەبووە، تاکە شانازی کە هەیبێت مانەوەی زمانەکەیەتی، ئەدەبیاتیش بێگومان تەنها لەناو زماندا دەژی و شیعریش بوونەوەرێکی زمانەوانییە، بۆیە خوێنەری کورد

خوێنەرێکی زۆر زیرەکە و خۆڕسکانە تێکستی باش و خراپ لەیەکتر هەڵاوێرد دەکا.

ئەدەبیاتی کوردی لەم قۆناغەی ئێستایدا، سەرەکیترین ئەرکی ئەوەیە دەسەڵاتی نووسەر بەسەر تێکستدا نەهێڵێت. ڕۆلان بارت پێی وایە دەسەڵاتی نووسەر بەسەر تێکستدا تەنها یەک ڕەهەند و یەک مانا دەداتە تێسکت، لە کاتێکدا لەگەڵ نەهێشتنی دەسەڵاتی نووسەر بەسەر تێکستدا، ئەوا هەر خوێنەرە و مانایەک بۆ ئەو تێکستە دەدۆزێتەوە. ڕێگەدان بە دۆزینەوەی فرەیی لێکدانەوە لە لایەن خوێنەرەوە، بەندە بە نەمانی دەسەڵاتی نووسەر، کە پێم وایە زۆر ئەستەمە هەندێک لە نووسەرانی کورد دەست لە عەرشی لەززەتی نووسەربوون بشۆن و تەنانەت ڕەنگە لەوە ئەستەمتر بێت کە بڕوا بە دیکتاتۆرێک بێنی دەست لە دەسەڵات هەڵگرێ! ئەو نووسەرانە وا تێگەیشتوون خوێنەریان بە کرێ گرتووە و پێویستە خوێنەران بەرز ببنەوە بۆ ئاستی تێکستەکانیان! هەندی نووسەر پێی وایە ئەو تێکستە چڵ پەڕە شەخسییەی نووسیویەتی، دەبێت خوێنەرە بێدەسەڵاتەکان بە ناچاری بیخوێننەوە.

کێ خاوەنی دەقە؟ نووسەر، خوێنەر یان ڕەخنەگر؟

مێژووی خاوەندارێتیی دەق مشتومڕێکی زۆر هەڵدەگرێت، لە سەدەکانی هەژدە و نۆزدەیەمدا دەسەڵاتی نووسەر بەسەر دەقدا نیمچە ڕەها بوو، لەوێ خوێنەر تەنها ڕۆڵی دەروێشێکی دەبینی کە تەنها بۆی هەبوو سەر بلەقێنێ بۆ ئەو ڕابەرە ڕۆحییەی پێی دەگوترا: نووسەر.

لە سەدەی بیستەمدا لەسەر دەستی بونیادگەرەکاندا هەوڵ درا کەمێک لەو دەسەڵاتەی نووسەر بدرێتە دەق و دەسەڵاتی نووسەر بەسەر دەقدا کەم بکرێتەوە، لە ئێستاشدا خوێنەر دەبێتە بەشە شەریکی دەسەڵات بەسەر دەقدا، کە ئەمەش بەپێی لێکدانەوە ناوازەکانی فەیلەسووفی فەرەنسی ڕۆلان بارت (١٩١٥-١٩٨٠) خۆی لە مردنی نووسەر و لەدایکبوونی خوێنەردا دەبینێتەوە، بەو واتایەی دەقی سەرکەوتوو ئەوەیە کە ئەو کاتەی خوێنەر دەیخوێنێتەوە، کەمترین تارمایی نووسەری بەسەردا دەمێنێت، ساتی لەدایکبوونی خوێنەر یەکسان دەبێت بە مردنی نووسەر.

ئەم هاوکێشەیەی دابەشکردنی خاوەندارێتیی دەق بەسەر نووسەر و خوێنەردا، تا ئەو ڕادەیە ئاساییە کە مشتومڕەکان لەپێناو چێژی دەقدایە، بەڵام لەولاتر توێژێک هەیە ناویان لە خۆیان ناوە ڕەخنەگر (کە گابریێل گارسیا مارکیز پێیان دەڵێت نەفامەکان) و ئەوان بانگەشەی خاوەندارێتیی دەق دەکەن، مارکیز پێی وایە و ڕاستیش دەکا: ئەو توێژە نەفامانەی

ڕەخنەگران خۆیان لێ بۆتە پزیشکی تەشریحکردن و وەکو جەستەیەکی مردوو مامەڵە لەگەڵ دەقدا دەکەن، کە بەدونیابینیی نەفامانەی خۆیان دەیانەوێت هۆکاری مردنی دەق لە ڕێگای ئەو تەشریح-ڕەخنەگرتنەوە دەستنیشان بکەن و بیسەلمێنن کە ئەوە تەنها ئەوانن دەتوانن بە خوێنەرەکان بڵێن: دەقەکان چ نەخۆشییەکیان هەڵگرتووە!

لەم سۆنگەیەشەوە دەبینین مێژووی لێکدانەوە و خوێندنەوە و ڕەخنەگرتن لە نێوەندی ئەدەبیاتی کوردیدا، بەشێوەیەکی دیار، مێژووی داگیرکردن و قۆرخکردنی دەقە.

لە هونەری فۆتۆگرافەریدا، جۆرە گرتەیەك هەیە پێی دەگوترێ "گرتەی چاوی هەڵۆ"، ئەمە بەو گرتەیە دەگوترێت کە لە سەرەوە دەڕوانێتە خوارەوە و گۆشەنیگایەکی فراوان دەگرێتەخۆ، پێچەوانەی ئەمەش گرتەی چاوی بۆقە کە لە خوارەوە دەڕوانێتە سەرەوە و لە گۆشەنیگایەکی تەنگەوە قەبارەی بینینەکان گەورە دەکات.

جیاوازیی گرتەی هەڵۆ و گرتەی بۆق لە دەقدا، بۆ هۆشیاری و دونیابینیی نووسەر دەگەڕێتەوە. نووسەری ئینگلیزی کۆڵن ویڵسۆن (١٩٣١-٢٠١٣)، لە کتێبە نایابەکەیدا (بێ ئینتیما) باس لە دونیابینیی کرم و باڵندە دەکات، کە چۆن کرم چەند سانتیمەترێک دەبینێت و پێی وایە ئەو بینینە هەموو دنیایە و لەسەر ئەو بنەمایەش حوکم دەدات، لەکاتێکدا باڵندە لە سەرەوە گاڵتەی بە ملیۆنەها لەو سانتیمەترانە دێت!

نووسەری وریا و تێگەیشتوو پەڕ و باڵ پەیدا دەکات و بە

هەوڵ و ئەزموون دەگاتە ئەوەی بەرز ببێتەوە، بەرزتر لە شارێک، لە ئایدیایەک، لە مەزهەبێک، لە حزبێک، تەنانەت لە جێندەریش..

لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هەرچی خەونی یەکسانی و تەمەندرێژی و تەندروستی و دادپەروەری هەیە، لە کۆتاییدا تێکەڵ بە پرۆژەی دەسەڵاتەکانی قازانجکردن و پاوانکردن و دەستەبەرکردنی پاوەر و دەسەڵات کراوەتەوە.. ئەوەتا مێژووی کەسایەتییە ئایینییەکان بە ناوی ئاسوودەیی ڕۆحییەوە بوونەتە خاوەن ڕەوە ئەسپ و ڕیزە خانوو و پۆلە کەنیزەک. ئەوەتا پزیشکەکان بە ناوی تەمەندرێژیی و تەندروستیی باشەوە دەبنە خاوەن ژیانی شاهانە، ئەوەتا حاکمەکان بە ناوی دادپەروەرییەوە دەبنە خاوەن پاوەر و بەهای کۆمەڵایەتی و هتد.. مێژووی مرۆڤایەتی زنجیرەیەکی درێژە لە داگیرکرنی خەون و وەرگرتنی سەرمایەی ڕەمزی.. تەنها شاعیر و نووسەرەکان نەبێت کە زۆربەی هەرە زۆری لە بەدەستهێنانی ئەو سەرمایە ڕەمزییە کشاونەتەوە، ئەرێ ئەدگار ئالان پۆ لە کۆشکێکی ڕازاوەدا مرد یان لە جادەیەکدا بە هۆی سەرماوە ڕەق بۆوە؟! ئەرێ کوا قەسر و قەمەرەکانی سوهرابی سوپهەری؟! ئەرێ موتەنەبی بۆچی ناچار بوو شۆربایەک لە حەرەمی کۆشکی سەیفودەولەدا بخوا؟! ئەرێ حەلاج وەکو خولەفاکان لە باوەشی کەنیزەکانیدا مرد یان بە هەمان ئەو مێخ بزمارانەی مەسیح دەیگوت: منم حەق؟!

ئەرێ نالی چی کەمتر بوو لە ئەمیرەکانی بابان، تاوەکو لە شاری مەککەدا ناچار بێت سێ بزن و کارێک بەخێو بکات؟!

ئەرێ حاجی قادری کۆیی چی لە شێخ و ئاغاکانی کۆیە کەمتر بوو، کەس نەبوو لە توێشووەکەیدا دوو قلە هەنجیری تەق تەقی بۆ بخاتە ناو پارووە نانێکەوە؟!

ئەرێ قانع بەو ڕیکۆتە ڕەشە تۆزاوییە درێژەوە، لە هەموو ڕێکپۆشەکانی ئەو زەمانە بە هەیبەتتر نەبوو؟!

لە هۆمیرۆسەوە تا ئێستا، ئەوەی لەنێوان شەڕێک و شەڕێکدا گۆرانی گوتووە هەر شاعیرەکان نەبوون؟!

وێڕای ئەو هەموو ناهەقییە، سەرەڕای ئەو هەموو غەدرە، هێشتا شاعیرەکان پێیان وا بووە: ژیان جوانترە لە مردن.!



# ڕۆژگاری وشکێ و
# چاوی تەڕ

لە ئەدەبیاتدا ئەوەی قووڵ بێت لە ڕوونی سڵ ناکاتەوە، زۆر جار "ئاڵۆزی"، مەبەستێتی قووڵییەکەی نەبینرێتە یان بیشارێتەوە.

داڕشتنی ئاڵۆز وەک ناوی لیخن وایە، قووڵیی دەشارێتەوە، بۆچی دەبێ لە شیعرەکانی دادایزمەکان تێبگەم، لە شیعرەکانی سووریالییەکان تێبگەم، بەڵام لە شیعری شاعیرێکی کورد تێنەگەم؟! وێڕای ئەوەی شاعیرە کوردەکە بە زمانێک دەنووسێت کە زمانی دایکە!

شیعری نوێ جێگەی ئەوە نەساوە حەشر و قیامەت تێکەڵ بکات، تابووت و خوێن و دوژمن بخاتە ڕستەی ئاڵۆزەوە، شیاوە مانا ئاڵۆز بێت، بەڵام مەرجە داڕشتن ڕوون بێت.

10,000 IQD




دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

FAM PUBLICATION
+964 750 773 71 76
info@fam.pub • www.fam.pub
FAMpublication